

# مجلة الأكاديمية الكوردية

العدد: ١٢

أربيل ٢٠٠٩

# Academy

*Journal of the Kurdish Academy*

Vol. **12**

Kurdistan – Hawler (Erbil)

2009

**ناوەرۆک:**


- کاری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا (تێڕوانینێکی واتایی)
پ.ی.د. طالب حسين علي ........................................ ١٧
- زمانی ستایش لە شیعرەکانی (حاجی قادری کۆیی)دا
د. خانزاد عەلی قادر ........................................ ٤١
- عەشیرەتی سورچی (لێکۆڵینەوەیەک لە ئەنتۆ - جوگرافیادا
د. عەبدوڵڵا غەفور ........................................ ٧١
- هەندێ لایەنی بانگکردن لە زمانی کوردیدا
پ.ی.د. ساجدە عەبدوڵڵا فەرهادی - د. شلێر رەسول محەمەد ............. ١١٦


**القسم العربي:**


- الاضطرابات النفسية لدى النساء بعد تعرضهن للقصف
الكيمياوي في مدينة حلبجة الشهيدة
ا.د. شەوبو عبدالله ملا طاهر ........................................ ١٤٣
- دور برنامج ارشادي تربوي لتنمية التسامح الاجتماعي لدى
طلبة كلية التربية في جامعتي كركوك وصلاح الدين
ا.م.د.علاءالدين كاظم عبدالله
ا.م.د.عمر ياسين ابراهيم الجباري ........................................ ١٧٢

## ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
## لە گۆڤاری (ئەکادیمی) کوردی دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاو دەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیرو هزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاو کرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت.

# ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەرۆک و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێک لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستە ڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەرە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستە مرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت.

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێک هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بلاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەلاّم لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بلاّو دەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش **Abstract**، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەرۆک و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (**Abstract**) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێک لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەرۆک و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی بلاّوکەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەکەم)، شوێن و ساڵی چاپکردن، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە لێکۆڵینەوە وەرگیرا، ناوی لێکۆڵەر، ناونیشانی لێکۆڵەر، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، شوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

(٦) ئەگەر لێکۆڵینەوەکە ساغکردنەوەی دەستنووسێک لەخۆ بگرێت، پێویستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچ بکرێت.

(٧) بەرەچاوکردنی بیرۆکەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکە، دەستەی نووسەران، ئەو مافەی هەیە دەستکاری هەندێ لایەنی دارشتن بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بڵاوکردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) وا باشە لێکۆڵینەوەکە لەسەر (CD) تۆمار کرابێت و چوار دانەی ڕاکێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بکرێت.

(٩) لێکۆڵینەوەکە، نیشانی سێ شارەزای پسپۆری بابەتەکە دەدرێت، ئەگەر پەسەند کرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، ڕەزامەندی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێکۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەکادیمی بڵاویان دەکاتەوە، دەربڕین لە بیرو بۆچوونی نووسەر دەکەن، پێویستییەتی دەربڕینی گۆڤارەکە، ناگەیەنن.

**دەستەی نووسەران**

# تعليمات النشر
# في مجلة (الأكاديمي) الكوردية

المجلة مجلة فصلية. ينشر فيها النتاج العلمي من داخل وخارج اقليم كوردستان-العراق. وتكون البحوث مستوفية للتعليمات الخاصة بالنشر وتخضع للتقويم العلمي. ويتعين ان يتضمن البحث حلا لمشكلة قائمة أو متوقعة، أو يتضمن فكرة أصيلة أو جديدة أو اكتشافاً علمياً، على ان لايكون منشوراً أو مقبولاً للنشر في مجلة أخرى.

# التعلميات الخاصة

# بالشكل وترتيب البحث

١ـ يرسل البحث بأربع نسخ على اوراق بيضاء من قياس (A4) مع ترك مسافة ٥ , ٢سم من الجهات الاربعة، على ان لايزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٠) صفحة لبحوث العلوم الصرفة والتطبيقية وعن (٢٥) صفحة لبحوث العلوم الانسانية بضمنها الاشكال والجداول.

٢ـ ترفق بالبحث ورقة تتضمن عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية ووظيفته.

٣ـ لغة النشر هي اللغة الكوردية، ولامانع لنشر بحوث باللغتين العربية او الانكليزية. وتوضع الملخصات **Abstracts** باللغات الثلاث.

٤ـ يرتب البحث على النحو التالي:

أـ عنوان البحث: يتوسط أعلى الورقة الاولى، ويفضل ان يكون قصيراً وشاملاً.

ب ـ يوضح الباحث الهدف من البحث والنتائج والتوصيات المهمة التي توصل اليها.

ج ـ المقدمة والمتن والنتائج.

٥ـ اسلوب ترتيب المصادر في الهوامش.

أ ـ إذا كان الإقتباس من كتاب: يدون اسم المؤلف. بدون قلب الاسم، عنوان الكتاب بالكامل، الناشر، الطبعة، (عدا الطبعة الاولى)، مكان وتاريخ الطبع، الصفحة.

ب ـ إذا كان الإقتباس من بحث: يدون اسم الباحث، عنوان البحث، اسم المجلة الناشرة، رقم المجلة أو العدد، مكان وتاريخ النشر، الصفحة.

٦ـ حين يكون البحث تحقيقاً لمخطوطة تتبع القواعد والمناهج العلمية المعروفة، وترفق بالبحث ست صفحات من المخطوطة.

٧- تحتفظ هيئة التحرير بحقها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الالفاظ، بما يتلاءم مع اسلوبها في النشر، مع مراعاة المحافظة على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٨- يستحسن ارسال البحث على **CD** وارساله برفقة النسخ المذكورة.

٩- يعد البحث مقبولاً للنشر، ويزود الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد عرضه علي ثلاثة محكمين (خبراء) من ذوي الاختصاص.

١٠- ماينشر في المجلة يعبر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالضرورة تعبيراً عن وجهة نظر المجلة.

**هيئة التحرير**

هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر
ئۆ فیسی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی



IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTERY OF HIGHER EDUCATION
& SCIENTIFIC RESEARCH
UNIVERSITY OF SALAHADDIN - Erbil
Vice President Office
For Scientific Affair

ژمارە: ٣/ ٨٩٢٩

مێژووی زاینی ٢ / ٥ /٢٠٠٨
مێژووی کوردی ١٠ / ٢ /٢٧٠٨

بۆ/ ئەکادیمیای کوردی/ بەڕێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی کوردی

ب/ ڕەزامەندی

سڵاو و ڕێز..........

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە /٣٥٤ لە ٢٠٠٧/١١/١٩ .

دەربارەی ڕەزامەندی ئەنجومەنی زانکۆکەمان لەسەر ئەوەی کە گۆڤارەکەتان ببێتە گۆڤارێکی ئەکادیمی/ زانستی و پشتی پێ ببەسترێت بۆ بڵاوکردنەوەو بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ، دوای ئەوەی کە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی زانکۆ لە دانیشتنی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانکۆمان ژمارە (٨) ڕۆژی سێشەممە لە ڕێکەوتی ١/ ٤/ ٢٠٠٨ بەسترابوو. وە ئاماژە بە نووسراوی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ژمارە ن / ٢٣٥ لە ٢٠٠٨/٥/١٧ بە پەسند کردنی بڕیارمان دا بەرازی بوون و پەسندکردنی وەکو گۆڤارێکی زانستی / ئەکادیمی لەگەڵ ڕەچاوکردنی چەند تێبینی یەکی بچووك .......... لەگەڵ ڕێزدا

هاوپێچ//

- تێبینیەکان

د. محمد صدیق محمد
سەرۆکی زانکۆ

وێنەیەك بۆ//
- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ / لەگەڵ ڕێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی/ لەگەڵ بەراییەکان ..
- لیژنەی ناوەندی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە سەرۆکایەتی زانکۆ
- دەرکردە .

Kurdistan Regional Government
Presidency of Ministers Council
Ministry of Higher Education
and Scientific Research
Presidency of University of Koya
Office of President




حکومەتی هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە
نووسینگەی سەرۆك

ژمارە: ٧/٢٩/٢٨٦٩      بەروار: ٢/٦/٢٠٠٨

﴿فەرمانی زانکۆیی﴾

بابەت / ناساندنی گۆڤار

ئاماژە بە خاڵی (١) تەوەرەی سێ یەم کاروباری زانستی لە کۆنووسی چواردەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی زانکۆ لە ٢٠٠٨/٥/٢١ وە دوای هەڵسەنگاندنی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی بڕیار درا بە :-

ناساندنی ئەم گۆڤارە وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان و وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت .

پ. د. خدر مەعصوم

سەرۆکی زانکۆ

وێنەیەك بۆ:
- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ
- بەڕێزان یاریدەدەرانی سەرۆکی زانکۆ
- ڕاگرایەتی گشت کۆلیجەکان / زانستە کۆمەڵایەتییەکان
- دۆسیەی دەرچوو

www.koyauniversity.org      dnya

# کاری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا
# (تێڕوانینێکی واتایی)

**پ. ی. د. طالب حسین علی**
**کۆلێژی پەروەردەی مرۆڤایەتی**
**زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر**

**پێشەکی**

ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ (کاری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا) زاری ناوەڕاست تەرخان کراوە، مەبەستی سەرەکی لەم لێکۆڵینەوەیە شیکردنەوە و لێکدانەوەی کاری تێپەڕە لە تێڕوانینێکی سیماسینتاکسییەوە، واتە لێکۆڵینەوەکە تیشک دەخاتە سەر لایەنی واتایی و سینتاکسی ئەو جۆرە کارانە و چۆنیەتی بەکارهێنانیان لە زماندا، هەروەها لە ڕووی واتا و ڕێزمانەوە ئەو کارانە لە ئاراستەکردن و هەڵکەوتیاندا چەند ڕۆڵ و کاریگەرییان دەبێت لە بەرهەمهێنانی ڕستەکانی زماندا، چونکە هەندێ کار لە زمانەکەدا لە تێنەپەڕەوە دەکرێن بە تێپەڕ، هەندێ کاری تریش کە بە تێپەڕ دادەنرێن، بەڵام وەکو کارێکی تێنەپەڕ ڕەفتار دەکەن و لە سنووری بەکارهێنانیاندا بەرکاریان لەگەڵدا بەکارنەبراوە، واتە لە ڕووی بەکارهێنان و کاریگەرییەوە بەکارێکی تێپەڕ - تێنەپەڕ دادەنرێن.

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە کارانە لە کوردیدا تاکو ئێستا لە ڕوانگەیەکی واتاییەوە لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ و تایبەتییان لەسەر نەکراوە، بۆیە بە پێویستمان زانی لەم باسەدا تیشک بخەینە سەر ئەو جۆرە کارانەی کە هەڵکەوت و ڕەفتارێکی جیاوازیان هەیە لە نێوان هەموو کارەکانی تری زمانەکەدا.

لەبەر ئەوە هەوڵدراوە ئەو جۆرە کارانە لە زمانەکەدا دیار بکەین و لە ڕووی هەڵکەوت واتاکانیان لێک بدەینەوە، هەروەها هۆکارەکانی پێویستیی بەکارهێنانی ئەو کارانە بەو شێوەیە دیاربکەین و بیانخەینەڕوو.

باسەکە لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو جۆرە کارانە پشت بە میتۆدی پۆلکردنی واتایی دەبەستێت کە زانای ئەمریکی (وەلتێر کوک) دایناوە، هەروەها لە شیکردنەوەی ڕستەکاندا پەیڕەوی ڕێبازی گوێزانەوە کراوە.

**لێکۆڵینەوەکە جگە لە پێشەکی لە دوو بەش و ئەنجام پێکدێت:**

لە بەشی یەکەمدا باس لە بنەماکانی میتۆدی پۆلکردنی واتایی کراوە، لە بەر ڕۆشنایی ئەم میتۆدە ڕۆڵ و ئەرکی واتایی کاری تێپەڕ لە پرۆسێسی ڕۆڵە واتاییەکاندا خراوەتە ڕوو، کە جیاوازیی لە نێوان دوو جۆرە ڕۆڵی واتایی - دەرکەوتوو و دەرنەکەوتوو - دەکات. پاشان تیشک خراوەتە سەر کار و جێکەوتەکانی (**Position**)، ئەو جێکەوتانەی کە کار وەریاندەگرێت و چەند کاریگەریی بە سەریاندا هەیە، بە پێی ئەو دابەشکردنەی کە چۆمسکی دایناوە سەبارەت بە کارەکانی زمان.

بەشی دووەم: باس لە پێکهاتەی کار دەکات، بەشەکە لە دوو تەوەرەی سەرەکی پێکدێت، لە تەوەرەی یەکەمدا باس لە پێکهاتەی ئەوکارانە کراوە، کە لە تێنەپەڕەوە دەکرێن بە تێپەڕ، واتە ئەو کارانەی کە وەکو تێپەڕ/تێنەپەڕ بەکاردێن.

لە تەوەرەی دووەمدا تیشک خراوەتە سەر ڕێژەی تێنەپەڕی کارە تێپەڕەکان.

ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەش لە چەند خاڵێکدا دیارکراوە.

## بەشی یەکەم:

### ١-١ میتۆدی پۆلکردنی واتایی:

بۆچوون و بنەماکانی پۆلکردنی واتایی لە ساڵی (١٩٧٩)دا زانای واتاسازی ئەمریکی (وەلتێر کوک -(**Walter Cook**) دایناوە، وەکو میتۆدێکیش دەچێتە ناو چوارچێوەی تیۆرەکەی چۆمسکی - تیۆری بەرهەمهێنان و گوێزانەوە ـ ((ئامانجی سەرەکی ئەم میتۆدە بریتییە لە لێکدانەوە و پەسنکردنی ناوەڕۆکی واتایی پێکهاتەکانی زمان، لە بەر ئەوە کاتێ کە باس لە بابەتی تێپەڕ و تێنەپەڕ دەکرێت، ئەوا وەکو بابەتێک دەچێتە سنووری باسکردنی پێکهاتەکانی زمان، لەگەڵ ئەوەشدا میتۆدەکە پشت بە (کار ) دەبەستێت، بەوەی کە دەبێتە ڕەگەزێکی بنجی و ناوکی لە پێکهاتەی ڕستەدا، هەروەها وەک کرۆکێکی دینامیکی ڕۆڵ و ئەرکی واتایی خۆی لە پێکهاتەکەدا دەبینێ)). (مازن الوعر، ١٩٨٧: ٧٥)

واتە لە ڕێگەی کارەوە کە دەبێتە تەوەرەیەکی سەرەکی پرۆسێس و ڕۆڵە واتاییەکانی پێ ئەنجام دەدرێت، هەروەها قسەکەر لە ڕێگەی ئەو خەسڵەت و سیما واتاییانەی کە تایبەتن بە کار شارەزای جۆرەکانی کار دەبێت، بەم پێیە دەکرێ بڵێین، کە کار وەک هۆکارێکی سیمانتیکی کۆنترۆڵی ڕۆڵە واتاییەکانی تری ئەو

جێکەوتانە دەکات، کە لەگەڵیدا ڕوودەدەن، بەم جۆرە (کوک) سیما واتاییەکانی کاری دابەش کردۆتە سەر دوو جۆری سەرەکی:

**جۆری یەکەم** – ستوونی: ئەم جۆرە سێ سیمای واتایی جیاواز بە خۆیەوە دەگرێت، هەر کارێکیش تەنیا یەکێک لەو سیما ستوونییانە وەردەگرێت و هیچ کارێکیش نییە بە بێ بوونی یەکێک لەو سیما واتاییانە ڕوودات، سیماکانیش بریتین لەمانە:

١- سیمای واتایی بارگەیەن (stative): ئەمەش پێویستی بەڕۆڵێکی واتایی وا هەیە، کە بە بابەتێکی بارگەیەنی پێ دەردەبڕێت.

٢- سیمای واتایی کردەیی (process): ئەم سیمایە پێویستی بە یەک ڕۆڵی واتایی و ئەرکی هەیە، کە بە هۆی کارایەکەوە دەردەبڕێت.

٣- سیمای واتایی چالاک (Active): ئەم سیمایەش پێویستی بە دوو ڕۆڵی واتایی و ئەرکی هەیە، کە لە ڕێگەی کارایەک و بابەتێکەوە دەردەبڕێت. (مازن الوعر، ١٩٨٧: ٧٦)

**جۆری دووەم** – ئاسۆیی: ئەم جۆرە لە چوار سیمای واتایی پێکدێت، کە لە کارە سەرەکییەکاندا بەدی دەکرێن، بریتین لە:

١- سیمای چالاکی ٢- سیمای سوود وەرگرتن ٣- سیمای هەستی ٤- سیمای شوێنی

**سیمای واتایی (+ سوود وەرگرتن):** ئەم سیمایە پێویستی بە ڕۆڵێکی واتایی و ئەرکی هەیە،کە بەهۆی سوود وەرگرێکەوە دەردەبڕێت.

**سیمای واتایی(+ هەستی):** ئەم سیمایە ڕۆڵێکی واتایی وای پێویستە، کە بە ڕێگەی تاقیکراوێکەوە (مجرب) دەردەبڕێت.

**سیمای واتایی (+ شوێن):** ئەم سیمایەش دیسانەوە پێویستی بە ڕۆڵێکی واتایی و ئەرکی هەیە، کە بە ڕێگەی شوێنەوە دەردەبڕێت.

بۆ هەر سیمایەکی پۆلکردنی واتایی (ئاسۆیی) بە نموونەیەک یەکە واتاییە سەرەکییەکانی تێدا دەخەینە ڕوو:

١-[ + بارگەیەن] : stative

ئەم سیمایەی کار لە ئاکامی دەرکەوتنی ڕۆڵی واتایی بەرکار بە (بابەت + چەسپاو) دەردەخات، ئەو لایەنە واتاییەی پێکهاتەکەی پێ دەردەبڕێت، کە لە زمانی کوردیدا بە ڕێگەی دارشتنەوە (Derivation) وەردەگیرێت، بڕوانە

نموونەی(١):

**١- خانووەکە ڕووخاوە.**

**٢-[ + کردەیی ]: Process**

ئەم سیما واتاییەی کار ئەو پێکهاتەیەی لە کوردیدا پێ دەردەبڕێت، کە لە ڕووی دینامیکییەوە ناکارایی کارەکە نیشاندەدات، هەروەکو لە نموونەی (٢)دا دەردەکەوێت:

**٢- خانووەکە دەڕووخێ / ڕووخا.**

**٣- [+ چالاک]: active**

ئەم سیما واتاییە ئەو جۆرە پێکهاتەیەی لە کوردیدا پێ دەردەبڕێت، کە لە ڕووی دینامیکییەوە چالاکی کارەکە نیشاندەدات، وەک لە نموونەی (٣)دا دەردەکەوێت:

**٣-کرێکارەکە خانووەکەی ڕووخاند.**

ئەو کارانەی کە سیمای واتایی (بارگەیەن و کردەیی و چالاک) نیشاندەدەن

| بارگەیەن (ئاوەڵناو) (ئاوەڵناوی کراو و ئاوەڵناوی بکەر) | کردەیی (تێنەپەڕ) | چالاک (تێپەڕ) |
|---|---|---|
| شکاو | شکا | شکاند |
| جووڵاو | جووڵا | جووڵاند |
| ڕووخاو | ڕووخا | ڕووخاند |
| سووتاو | سووتا | سووتاند |
| ترساو | ترسا | ترساند |
| ڕژاو | ڕژا | ڕژاند |
| مردوو | مرد | مراند |
| کەوتوو | کەوت | کەواند |
| فڕیو | فڕی | فڕاند |
| خەوتوو | خەوت | خەواند |
| نوستوو | نوست | نواند |

**خشتەی ژمارە (١)**

| تێپەڕ | تێنەپەڕ |
|---|---|
| خستن | کەوتن |
| هێنان | هاتن |
| گۆڕین | گۆڕان |
| پچڕین | پچڕان |
| سوین | سوان |
| ڕشتن | ڕژان |
| بڕین | بڕان |
| کوشتن | مردن |
| کردن | بوون |

**خشتەی ژمارە ( ٢ )**

هەندێ کاری تری تێنەپەڕ بە هەمان ڕۆڵی واتایی بەرامبەریان هەیە و وەکو کاری تێپەڕ بەکاردێن:

دەرئەنجامی تێکڕای سیما واتاییەکانی ـ ستوونی و ئاسۆیی، لەم میتۆدەدا دیارکراون، سەبارەت بە کارەکانی زمان، دەکرێ لەم هاوکێشەیەدا بەم شێوەیە نیشانبدرێت:

**٣ سیمای ستوونی × ٤ سیمای ئاسۆیی = ١٢ سیمای واتایی**

ئەم دوانزە سیما واتاییە شایانی ئەوەن کە بتوانن پەسنی هەموو کارەکان بکەن لە هەر زمانێکدابن. هەروەها میتۆدەکە جیاوازیی لە نێوان دوو جۆر لە ڕۆڵی واتایی کردووە بەم شێوەیە:

١- ڕۆڵی واتایی دەرکەوتوو: ئەم ڕۆڵە بە شێوەیەکی سەربەخۆ و بەخورتی لە هەردوو ئاستی سەرەوە و ژێرەوەدا دەردەکەون (ڕوودەدەن).

٢- ڕۆڵی واتایی دەرنەکەوتوو: ئەمەش لە ئاستی ژێرەوەدا دەردەکەوێت، بەڵام لە ئاستی سەرەوەدا دەرناکەوێت، لەوانەیە هەست بە شوێنی جێکەوتەکەی بکرێت. ئەم ڕۆڵە هەستپێکراوە لە ئاستی سەرەوەدا ڕەنگە لە هەندێ باردا ڕووبدات و لە هەندێ باری تردا ڕوونەدات، لەم حاڵەتەشدا بە ڕۆڵی واتایی لابراو (دەرنەبڕاو) ئاماژەی بۆ دەکرێت، بڕوانە نموونەکانی (٤-أ ،ب):

**٤ -أ- نەوزاد دەخوێنێ.            [ كارا - بابەت ] بابەت لابراوە**

**ب - نەوزاد چیرۆک دەخوێنێ   [ كارا + بابەت ]**

بەڵام کە هاتوو ڕۆڵی واتایی لە ئاستی سەرەوەدا بەهیچ شێوەیەک ڕوونەدات، ئەمەش لەوانەیە بەم شێوەیە بێت:

أ - یان هاوتا دەبێت لەگەڵ ڕۆڵێکی تری واتایی

**٥- شیلان دەچێتە ماڵەوە.**

[ شیلان =کارا (Agent) ] و [شیلان = بابەت (Object) ]

ب - یان ئەوەتا لە ڕووی فەرهەنگەوە لەگەڵ کارێکی تردا تێکەڵ دەبێت، وەک لە (٦- ا،ب)دا ڕوون کراوەتەوە:

**٦- أ- ئازاد ئاوی دایە باخەکە.          [كارا، بابەت، شوێن]**

**ب- ئازاد باخەكەی ئاودا.              [كارا، بابەت، شوێن]**

لێرەدا بەرکاری (ئاو) لە ڕووی فەرهەنگەوە لەگەڵ کارەکەدا تێکەڵ بووە.

ئەو کارانەی کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا تیشکیان خراوەتە سەر ئەوانە نین کە بەرکاری لابراویان لەگەڵدایە، لەبەرئەوەی ئەو ڕۆڵە واتاییانەی لەگەڵدا دەردەکەوێت کە بە کارێکی تێنەپەڕ ئەژمار دەکرێن. واتە لەم بارەدا ڕۆڵی واتایی ـ کاری تێنەپەڕ ـ چۆتە ناو پێکهاتەی ئەو کارانەوە، چ پێکهاتەکە لە شێوازی ئەرێدا بێت، یان پێکهاتەکە گۆڕابێت بۆ شێوازەکانی تری دەربڕین وەک، شێوازی نەرێ و پرسیارکردن و پرسیارکردنی نەرێی. بۆیە لێرەدا پێویستە بە دوای ئەو جۆرە کارانەدا بچین و دیارییان بکەین، وەک کەرەسەیەکی لێکۆڵینەوەش مەبەست و ئامانجی باسەکەی پێ بخەینە ڕوو.

سەرەتا لە پێکهاتەی بنەڕەتی ـ ئەرێ ـ ی ئەو کارانەوە دەست پێدەکەین، پاشان دەچینە سەر پێکهاتەی گۆڕاوی کارەکان و دیارییان دەکەین، ئەمەش ئەو دەرفەتەمان بۆ دەرەخسێنێ کە بتوانین بەراوردی هەڵکەوت و کاریگەریی ئەو جۆرە کارانە بکەین لە دوو دەوروبەری جیاوازدا، دەوروبەرێک کە کارەکە تێپەڕە و بەرکاری لەگەڵدا دەرکەوتووە، لەگەڵ دەوروبەرێک کە کارە تێپەڕەکە دابەزیوەتە ئاستی کاری تێنەپەڕ.

### ١-٢ کار و جێکەوتەکانی:

هەرکارێک کە کارایەکی دەدرێتە پاڵ بۆ سەلماندنی ئەو ڕووداوەیە کە کارەکە گوزارشتی لی دەکات و لە لایەن کاراشەوە ئەنجام دەدرێت.

**٧- منالّەکە کەوت.**

**Vp Np1**

لەم نموونەیەدا کاری (کەوتن) دراوەتە پاڵ (منالّەکە)، لێرەدا ئەو مەبەستە دەگەیەنێت کە کەوتنەکە بە تەواوی بۆ ئەو کەسە بسەلمێنێت کە (منالّەکە)یە، نەک بۆ ئەوەی کە کەوتنەکە لە خۆیدا نیشانبدات، کارەکەش بە کارێکی تێنەپەڕ ئاماژەی بۆ دەکرێت، بەڵام مەبەست لە تێپەڕاندنی کار بە سەر بەرکاردا بەستنەوەی ڕوودانی کارەکە و ئەنجامدانییەتی بە سەر بەرکارەکەدا، کاتێک کە کارەکە بە سەر بەرکارەکەدا تێدەپەڕێنێ، وەک:

**٨- ژنەکە بزنەکەی دۆشی.**

**Vp Np2 Np1**

لێرەدا ئەو مەبەستە دەگەیەنێت کە دۆشینەکە لە ( **Np1**ژنەکەوە) ڕوویداوە بە سەر (**Np2** بزنەکە)، بەمەش بکەر و بەرکارەکە کۆبوونەتەوە بۆ ئەنجامدانی کارەکە، واتە کارەکە خۆی لە هەردوو (**Np**)دا دەبینێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە کارەکە چەند کاریگەری بە سەریاندا هەیە، بۆ ئەوەی پەیوەندیی واتایی نێوانیان نیشانبدرێت، کەکارەکە لە پێناویدا هەردوو (**Np**) بەرهەم هێناوە. لەگەڵ ئەو دابەشکردنەی پێشووی کار لە ڕووی کاریگەرییەوە بۆ کاری تێپەڕ و کاری تێنەپەڕ. چۆمسکی دابەشکردنێکی تری پێشکەش کردووە سەبارەت بە کارەکانی زمان، کە لە سەر بنەمای ژمارەی ئەو پێکهاتە ناوییانەی (فرێزە ناوییانەی) کە پەیوەست دەبن بە کارەوە، هەروەها کارەکەش بەناوکی (کرۆکی) ڕستە ـ **The nucleus of the sentence** – دادەنێت، دیارە ئەمەش لەگەڵ بۆچوونی لۆجیکی کارەکاندا دەگونجێت. بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەو کارانەی کە یەک جێکەوتە **one – place verbs** وەردەگرن. ئەمەش بە پۆلکردنی یەکەم دادەنرێت و بەرامبەر بە کارە تێنەپەڕەکان دەوەستێت، لێرەدا ئەو فرێزە ناوییەی کە پەیوەست دەبێت بە کارەکەوە دەکەوێتە جێکەوتەی کاراوە، بڕوانە (٩-ا-ب)

**٩-ا-منالّەکە نوست**

**Vp Np**

**ب- پیاوەکە دانیشت**

٢- ئەو کـارانەی کـە دوو جـێکەوتە Two - place verbs وەردەگـرن، لەم بارەدا کارەکە بە دوو فرێزی ناوی پەیوەست دەبێت، کە یەکێکیان جێکەوتەی کارا دەگرێت و ئەوی تریان جێکەوتەی بەرکار دەگرێت، وەکو لە (١٠)دا دەردەکەوێت.

**١٠- منداڵەکە پیاڵەکەی شکاند.**

Vp Np2 NP1

3- ئەو کارانەی کە سێ جێکەوتە Three– place verbs – وەردەگرن، لەم بارەدا کـارەکـە بە سێ فـرێزی ناوی پەیوەست دەبێت، فـرێزی نـاوی یەکـەم (NP1) شـوێنی کـارا دەگـرێت و (Np2) دەبێـتـە جـێکەوتەی بەرکـاری یەکـەمی کـارەکـە، (Np3) جـێکەوتەی بەرکـاری دووەم دەگرێت، (چۆمسـکی، ١٩٩٣: ١٣٦ - ١٣٧) بڕوانە :(١١)

١١- نەوزاد پارەکەی دایە ئەوان.

Np3 vp Np2 Np1

هەمـــان بیـــرۆکـــەی دابەشکـردنی کـــار لای سنیـــری - Tesniere - بەرچاو دەکەوێت،کاتێ کە کارەکان بە پێی توانایان پۆلێن دەکات بۆ دیارکردنی ژمارەی ئەو کەرەسە ناوییانەی کە پێوەی پەیوەست دەبن، واتە کار وەکو کەرەسەیەکی سەرەکی و بنجی لە ڕستەدا دەتوانێ دەستنیشـانی ژمارەی ئەو کەرەسانە بکات کە وابەستەی دەبن و لەگـەڵـیـدا دەردەکـەون، لەگـەڵ ئەوەشـدا ژمـارەی کـەرەسـەکـان بە پێی ئەو جـیاوازییـەی کە لە توانای کـارەکـاندا هەیە، جـیـاوازییـان دەبێت و دەگـۆڕێن. واتە فـرێزە ناوییـەکـان و ئاوەڵکارەکـان خـۆیان بە شـێـوەیەکی ڕاسـتـەوخـۆ بە کـارەکـەوە هەڵدەواسن، ئەمـانەش بە پلەی دووەم ڕاسـتـەوخـۆ دوای کـارەکـە دێن، هەرچی کـەرەسـەکـانی تره بە شـێوەیەکی ناڕاسـتـەوخۆ بە کـارەکەوە پەیوەست دەبن. (فـرید عـوض ٢٠٠٥-١٨) لە ڕاستیدا سنیری لە پۆلکردنەکەیدا تەنیا بایەخی بە لایەنی فۆڕمی کـارەکان داوە، هەروەکو ڕۆنانکارییـەکان لە سەری دەڕۆیشتن و پەیڕەوییـان دەکرد. دیسـانەوە سنیـری لە پێکهاتەی ڕستەدا پشتی دەبەست بە گـۆڕانی کـارێک بەکـارێکی تر، بەمـەش گـۆڕانی پێکـهـاتەی ڕسـتـەکـەی دەسـەلماندن بە گـوێرەی ئەو سیـمایانەی کە کارە سەرەکییەکان لە ڕووی تێپەڕی و تێنەپەڕییەوە وەری دەگرن بێ ئەوەی ئاماژە بە گرنگیی لایەنی واتایی بدات. سەبارەت بەو توانا و کاریگەرییـەی کە کارەکە هەیەتی لە وەرگرتنی ئەو فـرێزە ناوییانەی کە بە کارەکەوە بەندن، چونکە دەستنیشـانکردنی ئەو فرێزە ناوییانە و کاریگەریی کارەکە بەسەریاندا لەگەڵ لایەنی

گرنگی و بایەخی فۆرمی سەرەکیی کارەکان کە سنیری ئاماژەی بۆ کردووە (سەرچاوەی پێشوو: ١٩). لێرەدا خاڵی بەیەکگەیشتن و کاریگەریی نێوان سیمانتیک و سینتاکس دەستپێدەکات، ئەمەش لە ئاکامی ئەو وردبوونەوەیە هاتە کایەوە لە قوتابخانەی بەرهەمهێنان و گوێزانەوە سەبارەت بە دیراسەکردنی پەیوەندیی نێوان سیمانتیک و سینتاکسەوە کە بووە هۆی سەرهەڵدانی دوو بۆچوونی جیاواز. ((هەردوو بۆچوونەکە لەوەدا یەک دەگرنەوە کە پرۆسەی بەرهەمهێنانی رستە لە مێشکی مرۆڤدا ـ لە رووی تیۆرییەوە - گونجانێکی وردی ئاڵۆز لە نێوان هەرسێ پێکهێنەری فۆنۆلۆجی و سینتاکسی و سیمانتیکیدا هەیە، یەکێک لەو پێکهێنەرانە وەکو دینەمۆ کاردەکات و یەکەم هەنگاو هەڵدەنێ بۆ دەستپێکردنی پرۆسەکە، بەڵام جیاوازییان لەوەدایە کە کام پێکهێنەر یەکەم هەنگاودەنێت؟ چۆمسکی وای دەبینی کە سینتاکس هەنگاوی یەکەم جێبەجێ دەکات، پاشان واتا و دەنگ هەنگاوەکانی تر بەجێدەهێنێ، هەرچی بۆچوونی دووەمە بۆ ئەوە دەچێت کە کلپەی یەکەم لە پکهێنەری سیمانتیکەوە دەردەچێت، پاشان سینتاکس و دەنگ دەخرێنە ناو هەویرەکەوە کە پێکهێنەری سیمانتیکی بەرهەمی دەهێنێ و قۆناغەکانی دروستبوونی تەواو دەکات، بەم جۆرە دەبێتە رستەیەکی تەواو و ئامادەکراو بۆ ئەوەی بەکار بهێنرێت)). (جۆن لاینز، ١٩٨٦ : ١٣ - ١٤) لێرەدا دەشێ بپرسین: ئایا توانای بایۆلۆجی بەرهەمهێنانی زمانی، سروشتێکی پێکهاتەیی/سینتاکسی هەیە؟ یان سروشتێکی واتایی؟ ئەوەی لێرەدا دەردەکەوێت لایەنی واتایی چەند کاریگەری بەسەر کاردا هەیە و لە تێنەپەڕەوە دەیگۆڕێت بۆ تێپەڕ، یان بە پێچەوانەوە، پاشان رۆڵی پێکهاتەی سینتاکسی دێت، بە واتایەکی تر لایەنی سینتاکسی دەبێتە تەواوکەری لایەنی واتایی لە بەرهەمهێنانی رستەدا بە پێی ئەو پێکهاتەیەی کە پێویستی دەبێت لە یەکەم هەنگاو و سەرەتادا، بەم جۆرە دەکرێ کەرەسەی زمانی بۆ پێکهاتەکە زیاد بکرێت یان لابرێت، ئەمەش دەکرێ لە دوو باری جیاوازدا دەستنیشان بکرێت:

١- ئەگەر بێت و کارە تێنەپەڕەکە گوزارشتی واتایی کاری تێپەڕی بە خۆوە گرت، دەبێتە هۆی زیادکردنی جێکەوتەیەکی تر بۆ ئەو پێکهاتەیەی کە پێویستی پێ دەبێت، واتە ئەو کەرەسانەی کە رۆڵی واتایی بەشداربووانی تێدا نیشاندەدرێت.

٢- ئەگەر هاتوو کارە تێپەڕەکە ـ بۆ دوو کەرەسە ـ گوزارشتی واتایی کاری تێپەڕی بۆ یەک کەرەسە بەخۆوە گرت، ئەمەش دەبێتە کەمکردنەوەی ژمارەی بەشداربووان لە رۆنانی رستەکەدا. بڕوانە تەوەرەی (٢) بەشی (٢).

## بەشی دووەم:

### ٢- پێکهاتەی کار:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چوار جۆرە پێکهاتەی کار دەستنیشان کراوە لە زمانی کوردیدا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

پێکهاتەی کاری تێنەپەڕ کە پێویستی بە بابەت (بەرکار) نییە، پێکهاتەی کاری تێپەڕ کە پێویستی بە بابەتێک (بەرکارێک) یان زیاتر هەیە، پێکهاتەی ئەو کارانەی کە وەکو تێپەڕ / تێنەپەڕ بەکاردێن، واتە ئەو کارانەی کە ڕۆڵی واتاییان دەگۆڕێت و پێکهاتەکانیان لە تێنەپەڕەوە دەکرێن بە تێپەڕ و وەکو کارێکی تێپەڕیش بەکاردێن، ئەم بارە لە ئەنجامی ئەو گەشە و گۆڕانەی کە بەسەر کارەکەدا دێت، ڕوودەدات. هەروەها ئەو کارە تێپەڕانەی کە ڕۆڵی واتایی کاری تێنەپەڕ بە خۆیانەوە دەگرن.

### ٢- ١ / کاری/تێنەپەڕ/ تێپەڕ:

دەرکەوتنی یان هاتنی بەرکار لە ڕۆنانی ڕستەدا بەندە بە جۆری کارەکە لە وەرگرتنی یان وەرنەگرتنی بەرکاردا، بڕوانە ئەم نموونانەی خوارەوە:

**١٢ ا –ا – شیلان نووست.**
**ب– پیاوەکە مرد.**
**١٣– ا– شیلان منداڵەکە نووست.*
**ب– پیاوەکە مارەکە مرد. ***
**١٤ – ا– شیلان منداڵەکەی نواند.**
**ب– پیاوەکە مارەکەی مراند.**
**١٥– ا– شیلان ... نواند.***
**ب– پیاوەکە ... مراند.***

لە نموونەکانی (١٢ – ا،ب )دا کاری (نووستن و مردن) بە کارێکی تێنەپەڕ ئاماژەیان بۆ دەکرێت، لەبەرئەوەی پێویستییان بە تەواوکەری بەرکاری نییە، بڕوانە نموونەکانی (١٣ ـ ا، ب)، بەڵام لە نموونەکانی (١٤ ـ ا، ب)دا کاری (نواندن و

مراندن) به کارێکی تێپەڕ دادەنرێن و پێویستییان به تەواوکەری بەرکاری هەیە، دەرنەکەوتنی بەرکاریش لەو نموونانەدا دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی ڕستەیەکی نارێزمانی، بڕوانە نموونەکانی (١٥ ـ ا، ب)، کەواتە هەردوو بەرکاری (منداڵەکە و مارەکە) وەکو کەرەستەیەکی سەربەخۆ پێکهاتەی سینتاکسی ڕستەکانی (١٤ ـ ا، ب)دا دەرکەوتوون و ڕۆنانی فرێزی کاری (نواندن و مراندن)ی، لەگەڵ واتای سیمانتیکی ڕستەکانیان تەواوکردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بەرکار لەو جۆرە ڕستانەدا دەبێتە کەرەستەیەکی بنجی و پێویست وەک کەرەستە سەرەکییەکانی تری ڕستە (بکەر و کار) لە ڕووی سینتاکسەوە بۆ ئەرکێکی ڕێزمانی تایبەت بەکاردێت، هەروەها لە ڕووی سیمانتیکەوە پەیوەست دەبێت بەو چەمک و واتایەی کە کارەکە سنووری بۆ دادەنێت و ئەرکەکەی دیاری دەکات، کەواتە بەرکار وەکو کەرەستەیەکی بەخورتی لەگەڵ کاری تێپەڕدا دێت و ڕۆنانی فرێزە کارییەکە و واتای ڕستەکەش تەواو دەکات. واتە ئەو کارانە قۆناغێکی تر لەهێزی تێپەڕاندن وەردەگرن، لە ئەنجامی بەکارهێنانیان لە دەوروبەری جیاوازدا، وەکو تێنەپەڕ لە قۆناغێک و وەکو تێپەڕ لە قۆناغێکی تردا. لە ڕاستیدا جیاوازیی نێوان هەردوو لایەنی تێپەڕی و تێنەپەڕی لەو جۆرە کارانەدا پەیوەندی بە لایەنی واتا و دەوروبەری بەکارهێنانیانەوە هەیە، بۆیە ئەم جۆرە کارانە لە ڕووی گوزارشتی واتاییەوە پەیوەست دەبن بەو پەیوەندییەی کە لە سیما واتاییەکانی (بارگەیەنی و کردەیی و چالاک) دا هەیە، (بڕوانە خشتەی ژمارە (١))، لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی واتایی لەگەڵ فۆرمی کارەکاندا یەک دەگرن و هێزێکی تێپەڕاندنی زیاتر بەو کارانە دەبەخشن، کە لە هەندێ دەوروبەردا قسەپێکەری زمان زیادە دەخاتە سەر پێکهاتەی ئەو کارانەی کە تێنەپەڕن، واتە هێزێکی دەربڕینیان بە یارمەتی پاشگری (اندن) بۆ زیاد دەکات بەمەبەستی تێپەڕاندنیان بەسەر بەرکارێک یان زیاتر بڕوانە نموونەکانی (١٦ ـ ا، ب):

**١٦ – أ – منداڵەکە ترسا.**

**ب – پشیلەکە منداڵەکەی ترساند.**



کاتێ کەکاری (ترسا) لە (١٦، ا)دا بەیارمەتی پاشگری (اندن)ی تێپەڕاندن دەگۆڕێن بۆکاری (ترساند)، ئەوا پێکهاتەی ڕستەکە لە ڕووی ڕۆنان و واتاوە دەگۆڕێت و کارەکەش جگە لە بکەر پێویستی بە تەواوکەری بەرکار دەبێت و جێکەوتەیەکی بەخورتی لە ڕۆنانەکەدا بۆ دەکاتەوە، بۆئەوەی هەردوو لایەنی سینتاکسی و سیمانتیکی ڕستەکەی پێ تەواو بکات، بڕوانە (١٦ - ب).

وەک دەردەکەوێ پاشگری (اندن) لە کوردیدا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە گۆڕینی توانای کاردا، دەچێتە سەر ڕەگی هەندێ لە کارەکانی زمانەکە و دۆخی ڕێزمانییان دەگۆڕێت، ئەم دۆخەش پەیوەندی بە هێز و کاریگەریی کارەکەوە هەیە، کە لە تێپەڕی و تێنەپەڕیدا بەرچاو دەکەوێت، بۆیە لێرەدا دەکرێ ئەو دۆخە ڕێزمانییە بە پێی یاساکانی گوێزانەوە کە تایبەتن بە گۆڕینی جێکەوتەی کارەکان، بخەینە ڕوو، واتە ئەو کارانەی کە لە تێنەپەڕەوە دەکرێن بە تێپەڕ، هەروەها جیاوازیی نێوان هەردوو پێکهاتەکە دیاربکرێت، لە ڕێگەی پەسنکردنی ڕۆنانی هەردوو پێکهاتەکە، یەکەمیان کە پێکهاتەی کارەکە تێپەڕاندنی تێدا ڕووی نەدابێت، دووەمیان کە پێکهاتەی کارەکە تێپەڕاندنی بەسەردا هاتبێت وەک لە (١٧ ـ ا، ب) دا خراوەتە ڕوو:

١٧ ـ ا:



هەندێ لەو کارانە هەنگاوێکی زیاتر دەنێن بەرەو تێپەڕاندن بە سەر دوو بەرکاردا، واتە ئەو بەرکارانەی کە لە ڕۆنانی ڕستەکاندا خۆشیان پێویستییان بە تەواوکەرێکی تر هەیە بڕوانە (١٨ - ا، ب، ج):

**١٨ - ا - گۆران کراسەکەی دا به باوکی .**

**ب- ئەو تۆ بە پیاو دەزانێ .**

**ج - ئەوان دوژمن بە ئێمە خۆش دەکەن .**

لە نموونەکانی (١٨ ـ ا، ب، ج)دا هەرسێ بەرکاری (کراسەکە، تۆ، دوژمن) پێویستییان بە جێکەوتەیەکی تر هەیە، کە لە شێوەی فرێزێکی بەندا دەردەکەون و پەیوەندی لەگەڵ بەرکارەکانیاندا دەبەستن، بۆ ئەوەی وەک تەواوکەری بەرکارەکانیان واتای ڕستەکان بەیەکەوە تەواو بکەن، ئەگەرنا بە بێ بوونی ئەو فرێزە بەندانە ڕستەکان لە ڕووی واتاوە ناتەواو دەبن، بڕوانە (١٩ ـ ا، ب، ج، د):

**١٩ - ا - گۆران کراسەکەی دا .... .***

**ب - ئەو تۆ .... دەزانێ .***

**ج - ئەوان دوژمن .... خۆش دەکەن .***



یان بەکارهێنانی هەندێ لەو کارانە لە دۆخی کۆزەتیفدا وەک هۆکارێکی واتایی بۆ هەمان مەبەست، کۆزەتیفیش لە ڕووی واتا و ڕێزمانەوە پەیوەندی بەکاری تێپەڕو تێنەپەڕەوە هەیە، لە هەردوو باردا هۆکارێک دەبێتە هۆی ئەنجامدانی کارەکە، بڕوانە (٢٠ ـ ا، ب، ج، د):

**٢٠ - ا - پیاڵەکە شکا.**

**ب - شنە پیاڵەکەی شکاند .**

**ج ـ کامەران پیاڵەکەی بە شنە شکاند (کۆزەتیف)**

**د- کامەران بوو بە هۆی ئەوەی کە شنە پیاڵەکە بشکێنێ .**



### ٢-٢ / ڕێژەی تێنەپەڕیی کارە تێپەڕەکان :

هەندێ لە کارە تێپەڕەکانی زمانەکە لە چەند ڕێژەیەکی تایبەتدا جێکەوتەی بەرکاری خۆیان لە دەست دەدەن بە پێی ئەو دەوروبەرەی کە تێیدا ڕوودەدەن، بە واتایەکی تر جێکەوتەی بەرکار لەو جۆرە کارانەدا دەبێتە بەشێک لە پێکهاتەی کارەکە، هەروەها وەکو کارێکی تێنەپەڕ لەڕووی واتاو ڕێزمانەوە ڕەفتار دەکەن، چۆمسکی ئەو کارانە بە (ڕێژەی تێنەپەڕیی کارە تێپەڕەکان) ناو دەبات، مەبەستیشی لەو ناونانە ئاماژەکردنە بۆ ((ئەو کارە تێپەڕانەی کە وەکو تێنەپەڕ بەکاردێن و بەرکارەکانیشیان دەبێتە بەشێک لە ناوەڕۆکی واتایی کارەکان)).

لێرەدا نموونەی چەند کارێک لە زمانەکە وەردەگرین و بە ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەیان لە ڕووی سیمانتیک و سینتاکسەوە دەیانخەینە ڕوو:

– **کاری (نووسین و خوێندن)**: لە زۆربەی ئەو دەوروبەرانەی کە تێیدا دەردەکەون پێویستییان بە تەواوکەری بەرکار هەیە، واتە لە ڕووی هەڵکەوت و کاریگەرییەوە بەکارێکی تێپەڕ دادەنرێن و دوو جێکەوتەی بەخورتی وەردەگرن بڕوانە ئەم نموونانەی خوارەوە:

**٢١ – ا- (من) نامەکەم نووسی.**

**ب- (ئەوان) ناوی خۆیان نووسی.**

**٢٢ -١- (من) .... نووسی*.**

**ب- (ئەوان) .... نووسی*.**

**٢٣ – ا- (کاروان) وتارەکەی خوێندەوە.**

**ب- (ئێمە) ئەم چیرۆکەمان خوێندەوە.**

**٢٤ – ا- (کاروان) .... خوێندەوە*.**

**ب- (ئێمە) .... خوێندەوە*.**

بە لابردنی بەرکار لەو ڕستانەدا دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی ڕستەیەکی نارێزمانی وەک لە نموونەکانی (٢٢/ا، ب) و (٢٤ / ا، ب) دا دەردەکەوێت.

لە هەندێ دەوروبەردا (کاری نووسین و خوێندن) بەتایبەتی لە دەمکاتی ڕانەبردووی ئەرێ و ڕانەبردووی نەرێدا لە ئاستی سەرەوەدا بەرکارەکانیان بەدیار ناکەون، بەڵام لە ئاستی ژێرەوە لە ڕووی چەمکەوە هەست بە بوونی بەرکارەکانیان دەکرێت، بۆنموونە:

**٢٥ – ا– (ئێمە) وتار دەنووسین.**

**ب– (ئێمە) چیرۆک دەخوێنین.**

**٢٦ – ا– (ئێمە) .... دەنووسین.**

**ب– (ئێمە) .... دەخوێنین.**

**٢٧ – ا– (ئێمە) .... نانووسین.**

**ب– (ئێمە) .... ناخوێنین.**

کاری (نووسین و خوێندن) لە نموونەکانی (٢٦ / ا، ب) بەرکارەکانیان دیارە و بە پێی دەوروبەری ئاخاوتنەکە دەردەکەوێت، کە چی دەنووسین یان دەخوێنین (نامە، چیرۆک، وتار... هتد) لەبەرئەوە قسەکەر بە پێویستی نازانێ بەرکارەکە لە ئاستی سەرەوەدا دەرببڕێت، پێکهاتەی هەردوو کارەکەش لە نموونەکانی (٢٦ ـ ا، ب )دا لە ڕووی سیما واتاییەکانەوە بەم جۆرە دەبێت:

**[+ کردەیی+ هەستی+ کارا + تاقیکەرەوە – بابەت].. واتە بەرکار دەرنەبڕاوە.**



- **کاری (زانین):**
وەک کارێکی تێپەڕ لە زمانەکەدا بەکاردێت، لە ڕووی هێز و کاریگەرییەوە دوو جێکەوتە بە خورتی (کارا و بەرکار) وەردەگرێت بڕوانە نموونەکانی (٢٨،٢٩،٣١،٣٢):

**٢٨-(ئەوان) ڕاستی مەسەلەکەیان زانی.**
**٢٩-(ئێوە) ڕاستی مەسەلەکە دەزانن.**
**٣٠-(ئێوە) دەزانن. /(ئێوە) نازانن**
**٣١-(من) نهێنییەکەم زانی.**
**٣٢-(من) نهێنییەکە دەزانم**
**٣٣ ـ(من) دەزانم. /(من) نازانم**

لە هەندێ دەوروبەردا بەرکاری کاری (زانین) پێویستی بە تەواوکەرێکی تر دەبێت لە شێوەی گرێی بەندیدا دەردەکەوێت بڕوانە نموونەکانی (٣٤،٣٥):
**٣٤ ـ (من) تۆم بە پیاو زانی. / (من) تۆ بە پیاو دەزانم.**
**٣٥-(من) تۆم .... زانی / (من) تۆ .... دەزانم.**
کەچی لە نموونەکانی (٣٠، ٣٣)دا کاری (زانین) لە دەمکاتی ڕانەبردوو و ڕانەبردووی نەرێدا، جێکەوتەی بەرکارەکەی دەرنەبڕاو، واتە لە ئاستی سەرەوەدا دەرنەکەوتووە، بەڵام لە ئاستی ژێرەوە بە پێی دەوروبەری ئاخاوتنەکە هەست بە بوونی دەکرێت و دەزانرێت، کە بەرکارەکە چییە، وەک ئەوە وایە، کە وترابێت. کەواتە پێکهاتەی کاری زانین لە نموونەکانی (٣٠، ٣٣)دا لە ڕووی سیما واتاییەکانەوە بەم جۆرە دەبێت:
**[+ بارگەیەن + هەستی + کارا + تاقیکەرەوە - بابەت]**
واتە بەرکار لێرەدا دەرنەبڕاوە، دەکرێ ئاستی سەرەوە و ژێرەوەی هەردوو پێکهاتەی کارەکە بەم شێوەیە نیشانبدرێن:
**٣٦- ئێوە نهێنییەکە دەزانن: ا- ئێوە دەزانن /ب - ئێوە نازانن**

هەروەها پێکهاتەی کارە تێنەپەڕەکە لە ئەرێوە گۆڕاوە بۆ نەرێ بەیارمەتی ئامرازی نەرێکردن وەک لە نموونەی (٣٦-ب)دا دەردەکەوێت




**-كاری (بینین):**

لە زمـانی كـوردیدا لە ڕووی كـاریگەری و هەڵكەوتیـەوە بەكـارێكی تێـپـەڕ دادەنرێن، واتە لە زۆربەی ئەو دەوروبەرانەی كە تێیدا دەردەكەوێت پێویستی بە دوو جێكەوتەی بەخورتی دەبێت بڕوانە نموونەكانی (٣٧ - ا، ب):

**٣٧- ا - (شیلان) منالّەكانی بینی.**

**ب - (من) ئەوانم لە زانكۆ بینی.**

**٣٨- ا - (شیلان) .... بینی*.**

**ب - (من) .... لە زانكۆ بینی*.**

لە نموونەکـــانی (٢٨ - ا، ب)دا بە لابردنی بەرکـــاری (منالّەکـــان، ئەوان)، ڕستەکان چ لە ڕووی ڕێزمانەوە چ لە ڕووی واتاوە نادروست دەبن. کەچی لە هەندێ دەوروبەردا کـــاری (بینین) بەبێ بەرکـــار دەردەکـــەوێت، بەتایبـــەتی لە ڕێژەکـــانی ڕانەبردووی نەرێ کردندا

**٣٩-ا- (ئەوان) ئێمە دەبینن.**
**ب - (من) تۆ دەبینم.**
**ج- (نەوزاد) ئەوان نابینێ.**
**٤٠- ا- (ئەوان) دەبینن.**
**ب- (من) دەبینم.**
**ج- (نەوزاد) نابینێ.**

ئەگەر بڕوانینە کاری (دەبینین، دەبینم، نابینێ) لە نموونەکانی (٣٩، ٤٠)دا لە ڕووی پێکهاتەوە وەکو یەکن، بەتایبەتی لە ڕووی ڕۆڵ و ئەو سیما واتاییانەی کە هەیانە بەم شێوەیە:

**سیمای واتایی (+ کردەیی)**
**سیمای واتایی (+ هەستی)**

سیمای واتایی (+ کردەیی) لە کاری (بینین) لە نموونەکانی (٤٠ - ا، ب، ج) ئەو لایەنە واتاییە بە جۆرێک نیشاندەدەن کە لە ڕووی دینامیکیەتەوە کارا نین، هەرچی سیمای واتایی (+ هەستی) لەو کارانەدا ئەو لایەنە واتاییە دەردەخەن، کە هەستکردن و بیر و سۆزیان پێ دەردەبڕێت. (مازن الوعر : ٧٩/ ٨٠) لەبەر ئەوە دەکرێ یەکەکان و ڕۆڵە واتاییەکانی ئەو کارانە لەو پێکهاتانەدا بە پێی میتۆدی پۆلکردنی واتایی کوک بەم شێوەیە بخەینەڕوو:

**[+ کردەیی + هەستی + کارا + تاقیکەرەوە ـ بابەت]**

واتە لێرەدا بەرکار نییە و دەرنەبڕاوە، دەکرێ ئاستی ژێرەوەی هەردوو پێکهاتە بەم شێوەیە نشانبدەین:




**-کاری (بیستن):**

ئەم کارە لە ڕووی هێزەوە وەکو کارێکی تێپەڕ تەماشا دەکرێت، واتە لە زۆربەی ئەو دەوروبەرانەدا کە تێیدا دەردەکەوێت پێویستی بە هەردوو جێکەوتەی (کارا و بەرکار) دەبێت، بڕوانە نموونەکانی (٤١- ا، ب)

**٤١-ا ـ (من) قسەکانی تۆم بیست.**
**ب- (ئێمە) ئەم پەندەمان بیستووە.**
**٤٢- ا- (من) بیستم**
**ب- (ئێمە) بیستوومانە.**

لە نموونەکانی (٤١ - ا، ب )دا دیارە کە کاری (بیستن) لەو دەوروبەرەدا پێویستی بە بابەتێک (بەرکارێک) هەیە بۆ ئەوەی لە ڕووی ڕێزمان و واتاوە دروست بێت، بە لابردنی بەرکارەکە، ڕستەکان ناتەواو دەبن بڕوانە (٤٢ - ا، ب) لەگەڵ ئەوەشدا (کاری بیستن) لە ڕێژەکانی ڕانەبردوو ڕانەبردووی نەرێدا پێویستی

بە بابەت (بەرکار) نییە، واتە لە ڕووی سیمای واتاییەوە وەکو کارێکی تێپەڕ/ تێنەپەڕ ڕەفتار دەکات، بۆیە دەکرێ یەکەکان و ڕۆڵە واتاییەکانی کاری (بیستن) لەو پێکهاتەیەدا بەم شێوەیە دیاری بکەین:

**[+ کردەیی + هەستی + کارا + تاقیکەرەوە ـ بابەت]**

بڕوانە نموونەکانی (٤٣ ـ ا، ب، ج)

**٤٣- ا ـ (شیلان) <u>دەنگی تۆ</u> دەبیستی / نابیستی.**

**ب- (شیلان) دەبیستی. (واتە گوێی لێیە و کەڕ نییە)**

**ج- (شیلان) نابیستی. (واتە گوێی لێ نییە و کەڕە)**

لە نموونەکانی (٤٣ ـ ا، ب، ج)دا دەردەکەوێت لە ڕووی ڕێزمان و لۆجیکەوە دوو جۆرە شیکردنەوەی جیاواز هەڵدەگرن، جیاکردنەوەی ئەو جۆرە ڕستانەش بە هۆی پەیوەندی و کاریگەریی کاری ڕستەکانە بە سەر بکەر و بەرکاردا، دیارە ئەمەش لە ڕێگەی واتای لۆجیکییەوە دەستنیشان دەکرێت، بە واتایەکی تر ڕەنگدانەوەی کاریگەریی کارەکە و پەیوەندیی بەو کەرەسانەی کە لە ڕۆنانی ڕستەکەدا جێکەوتەی بکەر و بەرکار پڕدەکەنەوە، لە نموونەی (٤٣ ـ ا)دا کاریگەری و هێزی کارەکە پێویستی بە دوو جێکەوتە هەیە، کەچی لە نموونە (٤٣ ـ ب، ج)دا، وەک کارێکی تێنەپەڕ لە ڕێژەی ڕانەبردوو و ڕانەبردووی نەرێدا، پێویستی بە یەک جێکەوتە هەیە.

### ئەنجامی لێکۆڵینەوە:

١- تێپەڕاندن (transitivity) وەک کردەیەک لە زماندا بە دۆخێکی ڕێزمانی دادەنرێت و هەر لە شیکردنەوەی ڕێزمانیشدا بەکاردێت بۆ دیاریکردنی پەیوەندیی نێوان پێکهاتەی کار و ئەو جێکەوتانەی کە لە ڕۆنانی ڕستەدا کارەکە وەریاندەگرێت، هەروەها گۆڕانی سیمانتیکی کار دەبێتە هۆی زیادکردنی یان کەمکردنی ئەو جێکەوتانەی کە بەشداری لە پێکهاتەی کارەکەدا دەکەن، واتە پێکهێنەری واتایی حوکم دەکاتە سەر ئەو کەرەسە ناوییانەی کە زیاد دەکرێن یان کەم دەکرێن لە پێکهاتەی فرێزی کاری و تەواوکردنی واتای ڕستەدا.

٢- لەم باسەدا چوار جۆر کار لە ڕووی کاریگەری و بەکارهێنانەوە دیاری کراوە بەم شێوەیە:

کاری تێنەپەڕ، کاری تێپەڕ، ئەو کارانەی لە تێنەپەڕەوە دەکرێن بە تێپەڕ، ئەو کارانەی تێپەڕن و وەکو کارێکی تێنەپەڕ بەکاردێن.

٣- هەندێ لە کارە تێپەڕەکانی زمانەکە وەکو کارێکی تێنەپەڕ بە کاردێن. دیارە ئەمەش پەیوەندی بە لایەنی سیمانتیکی و دەوروبەری بەکارهێنانی ئەو جۆرە کارانەوە هەیە، چونکە لایەنی واتایی کاریگەری ڕاستەوخۆ دەبینێ لە پێکهاتە و بونیادی ڕستەدا، هەروەها ژمارەی ئەو کەرستانەش دیاردەکات کە لەگەڵ کارەکەدا دەردەکەون ڕۆڵ و سیما واتاییەکانی کارەکەش دیاردەکات. ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە پێکهێنەری واتایی پێش پێکهێنەری سینتاکسی دەکەوێت لە بونیادنانی ڕستەکانی زماندا.

٤- لە ڕۆنانی ڕستەدا جێکەوتەکانی (کارا و بەرکار و تەواوکەری گوزارە و گرێی بەندی بە خورتی) وەک ڕەگەزێکی بنجی لە ڕووی ڕێزمان و واتاوە بۆ تەواوکردنی کار بەکاردێن.

**سەرچاوەکان:**

١- جون لاينز (١٩٨٦)، علم الدلالة السلوكي، ترجمة: مجيد الماشطة، دار الحرية للطباعة، بغداد.

٢- جومسكي (١٩٩٣)، المعرفة اللغوية طبيعتها واصولها واستخدامها، ت : الدكتور محمد فتيح، دار الفكر العربي ط١، القاهرة.

٣- كۆڕی زانیاری کورد (١٩٧٦) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

٤- عبدالقادر الفاسي الفهري (١٩٨٢) اللسانيات واللغة العربية، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد.

٥- عەلی مەحمود جوکل (٢٠٠٠)، تێپەڕ و تێنەپەڕی کاری ناسادە، گ. زانکۆ بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان، ژمارە (١٠)، هەولێر.

٦- عومەر مەحمود کەریم (٢٠٠٤)، کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)ی زانکۆی بەغدا.

٧- فريد عوض حيدر (٢٠٠٥)، فصول في علم الدلالة، مكتبة الآداب، القاهرة.

٨- مازن الوعر (١٩٨٧)، نحو نظرية لسانية عربية حديثة لتحليل التراكيب الاساسية في اللغة العربية، الطبعة الاولى، دار طلاس، دمشق

٩- مازن الوعر (٢٠٠١) دراسات نحوية ودلالية وفلسفية في ضوء اللسانيات المعاصرة، الطبعة الاولى، دار المتنبي سورية، دمشق.

١٠- محمد معروف فتاح (١٩٨٩) کار پۆلینکردن بە پێی ڕۆنان، گ. ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٢١).

١١- محمد معروف فتاح (١٩٩٢) باس لە جۆرێک لە ڕستەی کوردیدا، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٨).

١٢- محەمەدی مەحوی (٢٠٠١)، ڕستەسازی کوردی، زانکۆی سلێمانی.

١٣- محەمەد عومەر عەول (٢٠٠٨) کردەی تەواوکردن لە کرمانجی خوارووەدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی.

١٤- نايف خرما (١٩٧٩)، اضواء على الدراسات اللغوية المعاصرة، عالم المعرفة سلسلة (٩) مطبعة دار القبس، الكويت.

١٥- وریا عمر امین (٢٠٠٤) ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر

**16-Amin . W . O . (1976) Aspects of verbal construction in Kurdish, University of London .**

**17- Bussmann . Hadamod (1996) , Rautledge Dictionary of Language and Linguistics , by Routledge , new fetter I**

**18- Fattah , M . M . (1997) , Agenerative grammar of Kurdish , University of Amsterdam .**

## ملخص البحث

**أ.م.د طالب حسين علي**
**قسم اللغة الكردية- كلية التربية للعلوم الانسانية**
**جامعة صلاح الدين - اربيل**

تعني هذه الدراسة بالفعل المتعدي في اللغة الكردية وذلك من خلال بيان العلاقات النحوية والدلالية المنطقية بين مكونات الجملة، معتمدا بذلك على المنهج التصنيفي الدلالي للعالم اللغوي ولتركوك. وقد جاءت الدراسة في فصلين رئيسيين مع مقدمة ونتائج البحث.

يتناول الفصل الاول مختصر المنهج التصنيفي الدلالي مع بيان الادوار الوظيفية الدلالية للافعال المتعدية، ويتطرق ايضا لتقسيم الافعال على اساس النظر الى عدد المركبات الاسمية التي ترتبط الافعال بها.

تطرق الباحث في الفصل الثاني الى تراكيب الافعال المحولة من اللزوم الى التعدي، وتناول ايضا الافعال المتعدية ذات الطبيعة اللازمة، اي صيغة اللزوم لبعض الافعال المتعدية وختم البحث بأهم النتائج التي توصل اليها الباحث.

## Abstract

**Talib Hussen Ali**
**Assistant prof**
**Kurdish department- College of Education for Human science**
**Salahaddin University-Erbil**

**This research studies transitive verbs in Kurdish language. This is conducted within the logical semantics ? syntax relation between sentence components depending on semantic classification curriculum by the Linguist (Walter Cook). It consists of two sections and a conclusion.**

**The first section studies the summary of classification curriculum. It also studies the division of transitive verbs according to noun construction to which the verbs are related.**

**The second section contains changing verbs from intransitive into transitive. It also includes those transitive verbs having the property of intransitive.**

**The research ends with some significant results.**

# زمانی ستایش لە شیعرەکانی (حاجی قادری کۆیی)دا

د. خانزاد علی قادر
مامۆستا لە بەشی زمانی کوردی
کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان
زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

**پێشەکی**

هونەری ستایش لەناو کورددا لە سەردەمانێکی زووەوە هەبووە، گۆرانییە فۆلکلۆری و میللییەکانیش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە کورد بەگشتی گۆرانیبێژی لێهاتوو بووە و زۆر بەئاسانی بەسەر کێو و چیاو دەشت و دۆڵ و سوارچاکی و کچی جوانی خۆیانیان هەڵداوە. ئەمە ئەگەر بەو فراوانییەو بەو شێوە بەرفراوانە لەدەشت و دۆڵ و چیا لەناو لادێی قەدپاڵەکانی چیاو شاخ و دۆڵەکانی کوردستان هاتبێتە دی، خۆ شارستانیش لەم هونەرە بێ بەش نەبووەو لەوانیش کەمتر نەبوون، وەکو چۆن دەردەکەوێ کە حاجی بەسەر میرو پادشاو هەندی کەسایەتی لە زاناو شاعیرو ئاغاکانیدا هەڵداوە کەوا دانی بە پایەبەرزیدا ناون.

بەحوکمی ئەوەی کە سروشتی ستایش هەروەکو چۆن دواندان ئاڕاستەی گوێ بیست دەکری، بۆیە گرنگی کورتبڕی نەفەس بەدەربڕینەکە دەدرێ و واژەکان دەڕازێنرێنەوە، واژەی شیاو و گونجاو بۆ شوێنی پێویست هەڵدەبژێردرێن گرنگی بە ڕێککەوتن و گونجانی ئاوازەکانیان لەگەڵ یەکتردا دەدرێن بە جۆرێ تەنانەت شاعیر ئاگادارەو هەشیارە لەوەی کە هەر دەنگێکی لە دەنگەکانی لە شوێنی گونجاو و دیاریکراو دادەنێت، کە ئەم سیفەتە بەگشتی بەسەر هەموو بابەتەکانی شیعری گۆرانیدا دێتەدی، بەڵام شیعری پێداهەڵدان پێویستی زیاتری بەم هەستیاری و ئاگادارییەوە هەیە بەتایبەتی سیفەتی کورتبڕی نەفەس ئەم جۆرە شیعرە لە سیفەتە سەرەکییەکانیەتی، چونکە لەسەر شاعیر پێویستە تا پێی بکرێ پێداهەڵدانەکەی

کورت و قووڵ و بەرفراوان بێ و وێنەی قەشەنگ دابهێنێ سەرباری واتای بەرزی بۆ هێنانەدی کاریگەری دەبێ هونەری پێداهەڵدان لەو پەڕی ڕەوانبێژی و دەربڕینی بەرزو جوان بێ و ڕوون و پتەو و داڕشتنەکانی سەرنجڕاکێش بن، هەروەها تایبەتمەندی کورتبڕی (ئیجاز) لە ئاخاوتنەکانیدا وەکو تایبەتمەندییێکی هونەری پێداهەڵدان بەگشتی ئەو سیفەتە هەیە، جگە لە گرنگیدان بەمۆسیقا و بەشەکانی ئاخاوتن و فیکر و بۆچوونی نایاب و سەنگین و لۆژیکی تەواو، و تێگەیشتنێکی تەواو دروست لە چەمکی مەردایەتی و سوارچاکی سیفاتی مرۆڤی دادپەروەرو مرۆڤی ڕەوشت بەرز...هتد.

بەچاو پیاخشاندنێک بەشیعرە پێداهەڵدانەکانی حاجی دەتوانین دەستنیشانی زۆربەی ئەو سیفەتە هونەرییانە بکەین، لە شیعرە پێداهەڵدانەکانی بەسەر خواو پێغەمبەرو تا ئەوانەی بەسەر میرو زاناو عالیم و هەندێ کەسایەتی و شاعیرو کوردو نەژادی، پێشکەوتنی ئەوروپاو هەندی کەسانی ئەو ناوچەیەو تا دەگاتە شیعرەکانی خۆی.

- **چەمکی ستایش لە شیعرەکانی حاجیدا**

ستایش (پێداهەڵدان) شێوازێکی دەربڕینی مامناوەندی هەیە، زۆرجار شێوازێکی بەهێزو پتەوەو، هەندی جاریش ئاسان و سووکە لەهەردوو شێوازیشدا ئاشکرایی و کاریگەری هاتۆتە دی.

ستایش لە شیعرەکانی حاجیدا دوو ڕووگەیان هەیە، یەکێکیان بنەماکەی شاگەشکەبوون (اعجاب) بە کارو خووڕەوشتی بەرزو ئەوەی خاوەنی ئەو جۆرە خووڕەوشتە بەرزانەیەو هەمیشە ئامادەیە بۆ گەشەپێدان و بڵاوکردنەوەی کارو کردەوەی بەرزو کارپێکردنی کە مرۆڤ بەرز دەکەنەوە، مەبەستی شاعیر لەم جۆرە پێداهەڵدانە زیاتر چاککردنی باری کۆمەڵایەتییە، هەروەها جووڵاندن و هەژاندن و هشیارکردنەوەی ویژدانە لەبەردەم ئەو کارو کردەوە بەرزانەدا. بۆ نموونەی ئەم جۆرە ستایشە حاجی دەڵێ:

**«ئەی بێ نەزیرو هەمتا هەر تۆی کە بەرقەراری**
**بێدارو بێ دیاری ، بێدارو پایە داری**
**خەللاقی بێ فتووری ، سوڵتانی بێ قسووری**
**ڕەززاقی مارو مووری ، ئاودێری دێمەکاری»**[1]

هەروەها دەڵێ:

**«ئەی موحەممەد وەی ئەمینو ددەولە ئیمڕۆ کوێی تۆ**
**جەننەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوورکەوتەوە»** [٢]

رووگەی دووەمی ستایشەکانی حاجی لە سەر بنەمای هەستی نەتەوایەتی دامەزراوە، ئەم لایەنەی بۆ خزمەتی مەبەستە سیاسییەکانی میللەتەکەی خستۆتە کار کە هەمیشە لە بەرژەوەندی میللەتەکەیدایە و بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەکەی دەکاو لە نێو دوژمنان پایەدارو بەرزیان دەکاتەوەو دوژمنان دەترسێنی و هەجوی دوژمنانیان پێ دەکاو دەیەوی میللەتەکەی لەناوخۆ یەکگرتوو و کۆک بن، ئەم جۆرە ستایشانەی حاجی لە شیعرە سیاسییەکانیدا بەدی دەکرێن ئەوەتا لەم پارچە شیعرەیدا دەڵێ:

**«ئەمیرێک ماوە پاشایە گوتی: کێیە؟ گوتم : شێرە**
**گوتی: لێرە ؟ گوتم: لێرە: هەتا تاران و هیندستان**
**بەخۆی شێرە وەکو ناوی، لە شەڕدا دوشمن ئەندازە**
**تەمایان هەر بەئەو ماوە جەمیعی خاکی کوردستان»** [٣]

هەروەها دەڵێ :

**«خۆدەزانن سولالەیی ئەکراد**
**لێرەوە بگرە تا دەگاتە قوباد**
**هەموو عالیم، هەموو شێخ و میرن**
**زیرەک و ژیر و ئەهلی تەدبیرن**
**شەهسوارن پیادەیان ئازان**
**بەردی نیشان و کۆلکی مەیدان**
**دان و بەخشینیان لەلا باوە**
**خوونی مەیدانیان لەکن ئاوە »** [٤]

جگەلەوە هەندێ جار حاجی بەشیعرەکانی خۆشیدا هەڵدەدات و دەڵێ :

**«لە نقووش غەزەلم چین و خەتا داماون**
**کێ دەڵێ ئەمتیعەیی کوردە کەڵاش و کەپەنەک؟!»** [٥]
**«(حاجی) یە فیردەوسی یی کورد، سا ئەتۆش**
**گوێ وەکوو مەحموود مەدە قەولی بەدان**

**له مـــهجـــمـــووعی دووه‌لی ســـۆران و بۆتان**
**لەســـــایەی ئـەم کـــتـــێـــبـــە ناســـراوه**
**لەکوردان غـەیری ( حاجی ) و (شـێـخی خانی )**
**ئـەســـــاسی نـەظمی کـــــوردی دانەنـاوه »** [٦]

ئەگەر چاوێک بەشیعرە ستایشەکانی حاجیدا بخشێنین، بۆمان دەردەکەوێ کە حاجی، غـەزەل یان قەسیدەیێکی سەربەخۆی نییە کە لەسەرەتای دێڕی یەکەمی غەزەلەکە یان قەسیدەکە ستایش بێ تا دوا دێڕی، تاک تاک نەبێ، ئەویش لەشیعرە ئایینی و ستاییشە ئایینییەکانیدا کە تیایدا ستایشی خواو پێغەمبەر دەکا، وەکو ئەو پارچە غەزەلەی کە تیایدا دەڵێ:

**«ئەی بێ نـەزیرو هەمـــتـــا هەر تۆی کـــە بەرقـــەراری**
**بـێ دارو بـێ دیـاری ، بـێـــــــــــدارو پـایـە داری»** [٧]

هەروەها لەو پارچە غەزەلەی کە دەڵێ :
**«ئەی مـوحـەممەد وەی ئەمـــینو ددەولە ئـیـــمـرۆ کـوێی تۆ**
**جـەننەتێکە کـەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوورکـەوتەوە»** [٨]

بەگشتی شیعرە ستایشەکانی حاجی بەزۆری وەکو دێرێک یان چەند دێرێکی تاک تاک لەناو پارچە شـیـعـرێکی غـەزەل یان قـەسـیـدەدا بەدی دەکـرێ ئەو ستـایشـانەش بەسەر زمـانی کوردی و نەژادی کـوردو رەسەنی نەژادی ئەو مـیللەتەو ئازایی و زێد و نیشتـمان و خێرو بەرەکەتی ئەو نیشـتـمانە، چ کشـتوکاڵی بێ یان کانزایی ئەمەو جگە لە جوانی و خۆشی کەژو کێو و هەروەها خەڵکەکەی لەزیرەکی و دلێری و ئازایی و سوارچاکی و زمانی شیرینی و پێداهەڵدان بەسەر میـرو پادشا کۆنەکانیان و بەسەر شاعیرو شیعرەکانیان و تەنانەت بەسەر شیعرەکانی خۆشیدا هەڵدەدات بەشێوەی ڕاستەوخۆو ناڕاستـەوخۆ، و بەسەر شارەزایی و پێشکەوتنی پیشەسازی ئەوروپاو خستنەرووی ئەو پێشکەوتنە بەبەر گوێی کوردو ئەوانیش لەم ڕووەوە تەکـانێک بدەن و چاویان لێ بکەن، ئەمـەو جگە لە پێداهەڵدانی بەسـەر میللەتی کورد بەگشتی، لە گاوان و شوان و تا میـرو پاشاو ئاغاو زاناو سەییدو

عالیم و میرنشینەکانیان، تەنانەت بەسەر میللەتانی بێگانەش هەڵدەدات بۆ دەرس وەرگرتن و وروژاندنی کورد، هەروەها بەسەر هەندێ کەسانی ناسراوی زێدو ولاتی خۆی (ناوچەی کۆیێ) هەڵدەدات وەکو ( حاجی مەلا عەبدوللای جەلی زادە) و(حەما غا) و( ئەمین ئاغا )، ئەوەی لەو ستایشانەدا زۆر دووبارە دەبێتەوە پێداهەڵدانە بەسەر شیعرەکانی خۆی، کە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ستایشەکانی تر، ئەوا بەشێوەیەکی زۆر زەق و بەرچاو ئەوەمان بۆ دەردەکەوی سەرباری ئەوەی پارچەیێکی تایبەتیش هەیە لەم رووەوە هەروەها تاکە تاکەی دێری شیعریش لەناو پارچە شیعرەکانی غەزەل و قەسیدەکانیدا هێناوەتەوە، ستایشەکانیش لە ئەوپەڕی جوانیدان، حاجی لە شێوازی دەربڕیندا وەکو شاعیرێکی کلاسیکی(×) کوردی نوێ دەردەکەوێ، ئەمەش لەو پارچە شیعرەیدا دەبینین کە دەڵێ:

**«خەزنەیێکە بەیتی من دوو میصرەعم داخستووە**
**کەس تەماعی تی نەکا ڕێگای دزم لێ بەستووە»**(٩)

لەو ستایشانەی شاعیر بەسەر شیعرەکانی خۆیدا دەردەکەوێ کە شاعیر شیعرەکانی خۆی زۆر بە دڵ بووەو بەشیعرەکانی خۆی موعجیب بووە. ئەمەش سەیر نییە و مافی خۆیەتی کە شاعیر لایەنی جوانی و سیفاتە جوانەکانی شیعری خۆی بخاتە ڕوو بەتایبەتی ئەگەر ئەو سیفاتە جوانانەی کە دەیانداتە پاڵ شیعرەکانی ڕاستەقینە بن و پڕ بەپێستی ستایشکراوەکە بن، جا ئەوەی تێبینی دەکرێ لەو شیعرانە، ئەوەیە کە بەڕاستی لەشیعرەکانی خۆی دواوە، کە شیعرەکانی مایەی تەقدیرو شانازین و دەبێ بەهەند هەڵبگیرێن و بەچاوێکی بەرزو گرانبەها سەیر بکرێن تەنانەت ئەگەر هاتوو شاعیر لەو مەیدانەدا زێدەڕۆییشی کردبێ ناکرێ و ناشێ بەچاوی گومانەوە سەیری ئەو ستایشانە بکرێن. ئەوکاتە دەبێ بەچاوی گومانەوە سەیر بکرێن ئەگەر هاتوو سیفاتی ستایشکراوەکە یان شتە وەسفکراوەکە بەوەسفی جوان لەگەڵ حەقیقەتی تەواو پێچەوانە بن. واتە سیفاتی پایە بەرزی و فەزیلەت بدەینە پاڵ کەسێک یان شتێکی بێ بەهاو پووچ و ناسازو نارەسەن. شاعیر کە وێنەی کارێکی جوان و شاکار ئەکێشێ بەجوانترین شێوەو لەخۆی جوانتر ئەوە خۆی لەخۆیدا چاکەیەکە دەرهەق بەو بەرهەمە دەکا، ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێ کەوا سەرپێچی ڕێساو ئوسولی هونەری کردووە، یان لەیاساو ڕێسای باوی جوانکاری دەرچووە.

**واژەو زاراوەکانی ستایش (پێداهەڵدان):**

شایانی باسە واژەو زاراوە بناغەی پێکهێنانی سەرەکی شیعرە، چونکە شیعر «ئافەریدەی شتێکە ئەوشتە بەواژە نەبێ ئافەریدە نابێ»[10] هەر بۆیەشە شاعیران گرنگی بە واژەکانیان دەدەن.

ئەو واژەو زاراوانەی کە حاجی لە پێداهەڵدانەکانیدا بەرچاو دەکەون، واژەو زاراوەی ئاسایی و نامۆ نین، هەروەها بەشێوەیەکی ئاساییشی خستوونەتە دووتوێی شیعرەکەوە، وەکو ئەو واژەو زاراوانەی کە لەستایشی خوای گەورەدا دەبینرێن لە پارچە غەزەلی :

**«ئەی بێ نەزیرو هەمـــتـــا هەرتۆی کـــە بەرقـــەراری**
**بـێ دارو بـێ دیـاری ، بـێـــــــــــدارو پـایـەداری»[11]**

یان کە دەڵێ :

**«تـا کـــــــــورد و ئـەمـن لـە دەســـــــــتـی دوونـان**
**دەرچین ، هەر ئـەتۆی رەحـــــیـم و رەحـــــمـــــان»[12]**

واژەو زاراوەی وەکو : «بێ نەزیرو هەمتا، بەرقەرار، بێ دار، بێ دیار، بێدار، پایەدار، سەرمایە، پادشا، سەوادی ئەعزەم، بێ صەدر، شانشین، بێ پەردە پەردەداری، خەللاق، بێ فتوور، سوڵتان، بێ قسوور، ڕەززاق، ئاودێر، تەختی گەردوون، جێ و مەکان، بێ جێ و و بێ مەکان، لەیل و نەهار، ئەمری تۆ، مەدار، کاروباری عالەم، بێ صەدر، شەوق، خورشید، ماهی تابان، جارییە، مەحمەل، عەمار، مەعلووم». ئەو واژەو زاراوانە بەگشتی جێی تەقدیر و پایە بەرزی و گەورەیی و دەسەڵاتێکی بێ سنوورو بێ وێنە دەنوێنێ بەسەر هەموو شتێکا کە لە توانای هیچ مەخلوقێکدا نییەو نابێ. لەبەر ئەوەی ستایشەکە باوەڕ بەتاک و تەنیایی و بێ وێنەی خواو دەسەڵاتی خوای مەزن دەکا و ئەو باوەڕەش بەهۆی ئایینی ئیسلام لەناو موسوڵمانانادا چەسپاوە بۆیە واژەو زاراوەکان بەزۆری بەزمانی عەرەبین و تام و چێژی ئایینیشیان پێوە دیارە، وەکو ئەم واژەو زاراوانە: «بێ نەزیر، بەرقەرار، بێ دارو بێ دیار، فەقیر، سەوادی ئەعزەم، خەللاق، بێ قسوور، ڕەززاق، مەکان، لەیل و نەهار، ئەمر، عالەم، وەزیر، صەدر، جارییە، مەعلوم، مەدح، باری»[13] هەروەکو چۆن لە ستایشەکانی بەسەر پێغەمبەریشدا ئەو جۆرە واژەو زاراوانە بەدی دەکرێن لە پارچە غەزەلی: «ئەی موحەممەد وەی ئەمینوو ددەولە»[14] دا

ئەم واژە عەرەبی و ئایینییانەی تێدا بەدی دەکەین: «موحەممەد، ئەمینوو ددەولە، جەننەت، موددەت، دیار، غوربەت، توحفە، لازم، فەرد، فەزا، دنیا، عومر، بێ بەدەل، شەریک، ما اعظم، شأنك تعالى، رەحیم، رەحمان»[١٥] ئەم زاراوە پڕ ڕێزو تەقدیرانەش بەزۆری وەکو سیفەی بەرزی بۆ ستایش کراوەکە بەکار هاتوون وەکو: «بێ نەزیر، بێ هەمتا، بەرقەرار، بێ دار، بێ دیار، بێدار، پایە دار، بێ پەردە پەردەداری، بێ صەدرو شانشینی، خەللاقی بێ فتووری، سوڵتانی بێ قسووری ... ئەمینوو ددەولە ... هتد» بێگومان ئەو سیفەتانەش بەزۆری سیفاتی شمولین (گشتگرین) چونکە ئاشکرایە کە «عەقلیەتی شاعیران عەقلیەتێکی (تەرکیبی) ئاوێتەیە، مەبەست گشتگیرییە (تعنی بالشمول»)[١٦] ئەمەش بۆ ئەوەی دەسەڵات بەسەر هەموو لایەنی واتادا بگرێ و لە دواییشدا بتوانی ستایشکراوەکە لە ئەوپەڕی بەرزی دابنێت.

جگە لەوە ئەوەی لەم واژەو زاراوانە بەدی دەکرێ جگە لە سەروا پڕ ئاوازو نەغمە بەهێزەکە، جۆرە سەجعێکی دڵگیریش لەناو ڕستەکان و نێو دێرەکاندا بەدی دەکرێ کە نەغمەو ئاهەنگی شیعرەکە بەرزترو دڵگیرتر دەکاتەوە کاتێ کە دەڵێ:

**«بێ دارو بێ دیاری، بێدارو پایەداری**
**بۆ باغی مەردی باغی سەرمایەکەی خەزانی**
**بۆ مەزرەعەی فەقیران سەرمایەکەی بەهاری**
**تۆ پادشانیشانی بۆ هەر سەوادی ئەعزەم**
**بێ صەدرو شانشینی ، بێ پەردە پەردەداری**
**خەللاقی بێ فتووری، سوڵتانی بێ قسووری**
**ڕەززاقی مارو مووری، ئاودێری دێمەکاری»**[١٧]

لەم پارچەی سەرەوە بەم واژەو زاراوە پڕ بەهاو ڕێزدارو سەنگینانە چ جۆرە سەجعێکی خۆشڕۆی دروست کردووە. هەرچەندە دیاردەی سەجع زیاتر لەبابەتی پەخشاندا زۆر بەدی دەکرێ، کەچی حاجی توانیویەتی سوود لە هونەری سەجع وەربگرێ و لە شیعرەکانیدا بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش بیانخاتە کار بەمەش کاریگەریەکەی بۆسەر هەست و سۆزی خوێنەرو گوێگر بەهێزترو خێراترو سەرنجڕاکێشتر دەبێ، ئەمەو جگەلەوەی کە شاعیر ئەو سیفاتە ڕێزدارانەی کە ئاماژە بۆ (دەسەڵات و عەزەمەت و عەدالەت) و هەرچی سیفاتی بەرزو نایاب هەیە لە ستایشکراودا لەپاڵ یەکترو یەک بەدوای یەکتردا کۆیان دەکاتەوە، تابتوانی وێنەی

ئەو عــەزەمــەت و دەســەڵات و عــەدالەتەی کــە لەناو خــودی ســتــایشکراودا هەیە بیکێشێ تاکو ئاشکرای بکات، جا کە شاعیر بەو شێوەیە گرنگی بەو جۆرە واژەو زاراوانە دەدات، کـە ئەندێشـەیێکی فـراوان بۆ کێشـانی ئەو وێنەیە کـە بتـوانی لە جوانترین شێوەدا بێ و کاریگەر بێ بەکاری دێنی، هەر بۆئەوەی کە بتوانێ وێنەی ستایشکراوەکە نزیک بکاتەوە لە زەینی گوێگر یان خوێنەر. بێگومان ئەم قسەیە بۆ ستایشی خواو پێغەمبەر دەشێ بگوترێ، چونکە لای هەموومان ئاشکرایە، کە ئەگەر شاعیر هەموو تواناو هێزی ئەندێشەو سۆزو ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی و (بیان و بدیع) و چی مـەجازو جـوانکاری و هێـزو توانای زمـان هەیە بیـخاتـە کـار، ناتـوانێ وێنەی عەزەمەت و دەسەڵات و عەدالەت و چی سیفاتی خوای گەورە هەیە بیکێشێ، تەنیا ئەوەی پێی بکرێ هەر ئەوەیە کـە لە زەینمـان دەرک بەو وێنە بێ هاوتایە بکەین، چونکە هەموو مرۆڤێک ئەوە دەزانێ کە هیچ کەسێک و هیچ شتێک لە وێنەی ئەودا نیــیــە (لیس کـمــثله شیء)، بەڵام هێنانەوەی ئەو واژەو زاراوانەو ســیــفــاتانە و ڕیزکــردنیــان بەم شــێــوەیە جــۆرە بۆچوونێک لەناو هۆش و دەروونـدا دەچێنن کـە تەمسیلی ئەو عەزەمەتە بکات، نەک تەمسیلی بکات، بەڵکو نزیکی بکاتەوە لە تێگەیشتن و تصـورکـردنی ئەو وێنە بێ هاوتایە، ئەگـینا ئەو واژەو زاراوانەی کـە ئادەمیزاد بۆ ستایشکردنی گەورەیی و دەسەڵات و عەدالەت و هەموو سیفاتەکانی خوای پەروەردیگار بەکـاری دێنێ هاوتاو هاوشانی ئەو سیفاتانە نین کە لە خودای مەزندا هەن، واتە ئەو زمانە هەرگیز دابینی گەورەیی و عەزەمەت و توانای خوای گەورە ناکەن، بەڵام نزیکی دەکەنەوە، چونکە ئەو واژەو واتایانەی کە لە غەزەل یان قەسیدەی ستایشکردندا دەبێ، دەبێ واژە واتاکانیان لە پلەو پایەی ستایشکراوەکە دابن، واتە دەبێ ستایشکراو لە چینی پادشاو میر بێ ئەو زاراوەو واژەو واتای ئەم چینەی بۆ بەکـاربێ، ئەگـەر لە چینی عـالیم و زاناو عـاریف دابێ، ئەوەش واژەو زاراوەی خـۆی بۆ بەکـاربێ، بەم شـێـوەیە هەرچینەو واژەی لە قـەدەر پلەو پایەی خۆیدابێ، چونکە ستایشکردنی خوای مەزن جیایە لە ستایشکردنی پێغەمبەر ( د.خ ) یان بەسەر میـرو پادشا، یان زاناو عـالیم و عـاریف...هتـد. (ابن رشـیق) دەڵێ : « ئەگـەر شـاعـیـر سـتـایشی پادشـایێکی کـرد، دەبێ ڕێگەیێکی ڕوون بگرێتــەبەر لە هێنانەوەیادی پێـداهەڵدراو، دەبێ واتاکـانی پتـەو بن، واژەکـانی بێگەرد بن و بازاڕیی نەبن، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لە کەمو کورتی و لە پێ دەرچوون

و درێژەپێدان و ...هتد بەدووربن»[١٨].

شایانی باسە واژەو زاراوەکانی ستایشکردن بەزۆری لەدەوری ئازایەتی، ئارامگری، وەفاداری، نان بدەیی، پەیمان بەجێـهێنان، داوێن پاکی، گران و سەنگینی و، ڕۆشنفیکری و زانست و زانیاری...هتد دەسوورێنەوە، لەم جۆرە واژەو زاراوانەش لە شیعرە ستایشەکانی حاجیدا بەدی دەکرێن وەکو: «صەبیادی شەهێن، عەنقا، گوناه، کەریم، رازیق، بەمەئەل، هارەی شەش پەڕ، نەڕڕەی سوار، بەرقی شەشخانە، تەقەی ناڵ، جونبوش و لەرزین، زەبروزەنگ، بەشیر، حیشمەت، ئەمیر، شێر، دوشمن ئەنداز، تەما، فیردەوس، قەدرزانین، کتێب، هەمتا، شێخی خانی، قەدروقیمەت، خەزینەی گەوهەر، کیسەی دراو، لەسایە، سەناخوانی، جەننەت، شوهرەت، خەزنە، دیبا، قیامەت، ئەبکار، ئافتاب، موشتەری سەربستوو، تازەبافت، کارگەهی موشتەری، تاجیر، گەوهەر مەتاع، بەکوردی، تا مەحشەر دەما، ناوو نیشانی، پیاوە، نان و خوانی، بەهیممەت، پاسەبانی، کوردی و فەصاحەت، مەتانەتی، قوبەی خەوەرنەق، سەددی سکەندەری، ئەسپی مەیدانی سوخەندانی، خەزەف، گەوهەر، دوڕرو مەرجان دادەنێ، مەه، ئەیوانی کەیوان، فەننی گەیوەتە ئیعجاز، قوللەی ئیڤل، ئەفلاک، عەکسی، زەمین پێوان، جەووی سەما، بەبێ نوقسان لوغەت دەزانن، سەنعەت و بۆفەن، صاحیبی جاە، هەمتای اولیاء الله، کەلکیان دەگری، قەدر، درەفشی هەڵداوە، بێ موحابا، مەعمووریەیی ئەووەلە، بە بورهان، کوردن، بێ تەفرەقە، موطیع، هەم دەنگ، هەم مەشرەب، هەم لیباس، هەم ڕەنگ، باوکی خۆیان حادیث نییە ئەصلە، مەوروثە، بە نەسەب، کەریم، شوجعان، بێ بەدەل، و شەریک و تەنها، ماأعظم شأنک تعالی، رەحیم، رەحمان، خەملّیوە، وەکو بووک، یەک بەرگ، یەک زوبان، یەک رەنگ، بێ غەیبەت، و عەیب و عارو بێ دەنگ، مەردن، تەعالا، خالصا للە، بەئیدراکن، گەلێ چاکن، رەنگین، عیرفانن، هەموو عالیم، و شێخ و میرن، زیرەک، ژیبیر، ئەهلی تەدبیر، شەهسەوارن، ئازان، بەردی نیشان، کۆلکی مەیدان، دان و بەخشین باوە، مەیدان، شەجاعەت، سەخاوەت، حاتەم، وەفا، سموئیل و ئیسماعیل، عەهدو پەیمان، چیای قەندیل، حافیظی شەریعەت، سەییدی قەوم، شێخی میللەت، بۆی دەمرن، چەند چاکە، وەک کەرامەت، شەهسەواری بەلاغەت، یەککە تازی فەصاحەت، شێری بێشەن، حاتەمی جوود، کێوی جوودی، بەحری مەدوود، عوبەیدوڵڵای ئەحرار، زەڕخڕیدار، زەکاوەت کانی، تۆی دەراوی، ئیقرار، ویقار،

ئقتیدار، علوم، (کافیة) و ( شافی) ، واجب، حاجیب، نەفتەوەیهی، سیبەوەیهی، مەیدانی فەصاحەت، موجەللی، حەریری تالی، سەعدی موصەللی، دانا، ئەساسی علم، رۆستەمن، لەحاتەم زێترن، وەقتی سەخاوەت لەهەر عەیبێ بەری بن، وەک چیایە، قەلایە، غەمخواری بکا، صاحیب کار، پشتیوانی، نیگەهبانی خەزێنەی دین و دەوڵەت، مەهە، سەروە، نەقشبەندی، کیمیایە، دوڕو گەوهەر، گەزۆو مازووی چیایە، گەنمتان زێڕە، زیوە زیوان، کۆیە وەکو گرد، وەک فەرەیدوون ئەی عوتارید، سەججادە بەشان، کۆی فوصەحا، قەلەمت سنجقە شان، ئاهوو، رەوشان ...هتد».[١٩]

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەم واژەو دەستەواژەو زاراوانە لە هەموو ڕەنگ و جۆرەکانی ڕامێنین دەبینین لە سەرچاوەی جیا جیا وەرگیراون جگە لە کوردییەکان لە عەرەبی و فارسی و تورکی واتە لە ئەدەبی ڕۆژهەلاتیدا بەدی دەکرێن، سەرباری ڕۆشنبیری و شارەزایی شاعیریش بە عیلم و هونەرو پێشکەوتنی نەتەوەکانی ترەوە، کە یارمەتی شاعیری داوە، کە زاراوەکانی فراوانترو مەیدانی شیعرەکانیش بەرفراوانترو بەهێزتربن، بەبەراوردکردنی لەگەڵ عیلم و هونەرو پێشکەوتنی ئەوروپا لەگەڵ کورد، و سیفاتەکانی تریش لە پیاوەتی و سوارچاکی و مەردایەتی و ئازایەتی و نان بدەیی و بوێری، کە پێوەری بەرزی و گەورەیین، و چاکەو فەزیلەی مەعنەوین و بەخودی دەروونی مرۆڤەوە بەندن، هەمووی پێوەری تەواو راست و دروستن، لەناو جەرگەی کوردەواریدا هەر لەکۆنەوە هەبوونە.

هەرچەندە حاجی ئەم واژەو زاراوانەی کە هەڵیبژاردوون، شارەزایانە لە دووتوێی شیعرەکانیدا مەزراندوویەتی و هەروەها چی سیفاتی بەرزو جێی ڕێزگرتنن بەکاری هێناوەو بەشێوەیەکی هونەرمەندانە، و زۆربەی بابەتەکانی ڕەوانبێژی و ڕوونبێژیشی تێدا خستۆتەکار، ئەم دیاردەیەش لەشیعری حاجیدا بەکەم و کوڕی ناژمێررێ، چونکە شیعرەکانی حاجی بەگشتی ئەو مۆرکە ڕووکەشییەی (سطحیة) پێوە دیارە جا با بابەتەکەی بابەتی ستایشکردنیش بێ، شاعیر مەبەستی خۆی هێناوەتە دی، ئەگەر بەشێوازێکی سادەش بێت، چونکە زۆربەی شیعرە ستایشەکانی، تێکەلاو دەبنەوە لەگەڵ بابەتی سیاسی و نەتەوایەتییەکانیدا، کە ئەمەش بەتەبیعەتی حالاً ئەو سادەییەو ڕووکەشییەتەی دەوێ بۆئەوەی زۆربەی زۆری جەماوەر لێی حالی ببێ کە مەبەستی سەرەکی حاجی بووە، ئەگینا هەرگیز

نەیدەگوت: (بەیتەکان عەیبی مەکەن خوارو کەچن)[٢٠] کە بەیتە ستایشەکانیش خوارو کەچ نین، بەڵام ئەو هیچ شیعرێکی خۆی لەو مەبەستە بەدەر (استثنا) نەکردووە، بۆیە ئێمەش ئەو (سطحیە تە) ڕووکەشییە بە کەم و کوڕی و بێ توانایی و بێ هێزی شاعیر نادەینە قەڵەم، چونکە بەڕاستی بێ هێزنین، لەبەر ئەوەی حاجی سیفاتی گونجاوی بۆ پلەو پایەی مەقامی گونجاوی ستایشکراوەکە هێناوەتەوە، وەکو لەم نموونانەدا ئەو لایەنەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە دەڵێ:

**«ئەی بێ بەدەل و شەریک و تەنها**
**ما اعظم شانک تعالی»**[٢١]

کە لەو دێرە سیفاتی خوای مەزن دەخاتە ڕوو لەتاک و تەنیایی و بێ وێنەیی و گەورەیی بەدەستەواژەو واژەی: (بێ بەدەل، بێ شەریک، تەنها، (اعظم) لەهەموو شت گەورەترو بەرزی شانی خودا. کە ئەمانە بەحەقیقەت سیفاتی خودای گەورەن، حاجی لەخۆوە نەیهێناونەتەوە. هەروەها هێنانەوەی واژەو زاراوە وەسفییەکانی پارچە غەزەلی: (ئەی بێ نەزیرو هەمتا)[٢٢]دا کەئەم واژەو زاراوانەی تەقدیرو ڕێزلێنان لە پایەی بەرزی و دەسەڵاتی خوادا دەهێنیتەوە لە ستایشکردنەکەدا کە ئەوانە هەندێکیانن «بێ نەزیر، و هەمتا، بەرقەرار، بێ دار، بێ دیار، بێدار، پایەدار، سەرمایەی خەزان، سەرمایەی بەهار، پادشانیشان، بێ صەدرو شانشین، بێ پەردە پەردەدار، خەللاق، بێ فتوور، سوڵتانی بێ قسوور، ڕەززاقی مارومور، ئاودێری دێمەکار...هتد»[٣٣] کە هەموو ئەم سیفاتانە تەنیا لە شان و شەوکەت و دەسەڵات و توانای خوای گەورە دەوەشێنەوە، شاعیر بەهۆی ئەم واژەو سیفاتانە پەردە لەسەر حەقیقەتێکی نادیارو شارراوە هەڵدەداتەوە، چونکە سروشتی زمان هەر ئەوە نییە کە هۆکارێکی دەربڕین بێ بەڵکو هۆکارێکیشە بۆ دەرخستنی حەقیقەتی نادیارو شاراوە[٢٤].

حاجی لە چەند دێرێکی تردا ڕاستییەکی خەماوی سەبارەت بە کورد دەردەخات ئەویش دەتوانین بڵێین کە ستایشێکی خەم ئامێز و پڕ لە حەسرەتە ئەویش ئەوەیە کە هەموو کوردێک مەردە، بەڵام زەمانە وەکو گەردی لێکردوون پەرش و بڵاوی کردوونەتەوە ئەمەش لەو دێرەدا دەردەکەوێ کە دەڵێ:

**«هەرکوردن ئەگەرچی پاکی مەردن**
**پامالی زەمانە ، میسلی گەردن»**[٢٥]

هەر لەم ڕووەوە، سەبارەت بە میللەتی کوردەوە دەڵێ:

**«خــۆدەزانن ســـولالەیی ئەکـــراد — لێـــرەوە بگرە تادەگـــاتە قـــوباد**
**هەموو عالیم، هەموو شێخ ومیرن — زیرەک و ژیـیـــرو ئەهلی تەدبیـــرن**
**شـــەهســـــوارن، پیـــادەیان ئازان — بەردی نیـشـــان و کـۆلکی مـەیدان**
**دان و بەخـــشـــینیـــان لە لا باوە — خـــوونی مـــەیدانیـــان لەکن ئاوە**
**بەشەجاعەت هەموو وەکو ڕۆستەم — بەسـەخـاوەت هەمـوو وەکـو حـاتەم**
**لەوەفـا سـموەئیل و ئیـسـمـاعـیل — عەهدو پەیمانیان چیای قەندیل»[٢٦]**

ئەو سـیـفـاتانەی کـە جـێی ڕێزو تەقـدیرو شـایانی پلەو پایەی ئەو مـیللەتەیە، ئەوانەی کە حاجی هێناویەتیەوە و بەمە پیایاندا هەڵدەدات: «هەموو عالیم، شێخ، میـرن، زیرەک، ژیـیـر، ئەهلی تەدبیـر، شەهسـوار، ئازان، بەردی نیشـان، کـۆلکی مەیدان، دان و بەخشینیان لەلا باوە، بەشەجاعەت ڕۆستەم، بەسەخاوەت حاتەم، ...هتد». کە هەمووی واژەو زاراوەو سیفاتی قابیل بەکوردن.

هەروەها دەڵێ:

**«حـاکم و مـیـرەکـانی کـوردسـتـان — هـەر لـە بـۆتـانـەوە هـەتـا بـابـان**
**یەک بەیەک حافیظی شەریعەت بوون — سەییدی قەوم و شێخی میللەت بوون»[٢٧]**

ئەو سیفاتانەی کە هەمـووی ڕێزو تەقدیرە بۆ پلەو پایەی حاکم و میرە کوردەکان کە «حافیظی شەریعەت، سەییدی قەوم و شێخی میللەت بوون» ئەوەی تێبینی دەکرێ لەو ستایشانەی شاعیر ئەوەیە کە ستایشەکانی کورت و هەندی جاریش تاکە تاکـەن، ئەمـەش وا لە خـوێنەر دەکـات کـە لە خـوێندنەوەیان بێـزار نەبێت، بەڵکو سەرنجڕاکێشتر و جوانتر بێنە بەرچاو، کاتێ کە سیفەتەکان هیچیان سنووری ڕێزو پایەی ستایشکراوەکەیان نەبڕیوە. شاعیری شارەزاو زاناش، ئەوەیە کە لەو پێوانەیە دەرنەچووبێ، نەبەلای کـەمـی، نەبەلای زۆری هەروەکـو چۆن (قـدامـة) سنووری بۆ سـیـفـاتەکـانی سـتـایشکردن داناوەو کـۆی کـردوونەتەوە لە چوار سیـفـاتی چاک کـە ئەوانیـش: هۆش و ئازایەتی، و دادپەروەری، و پاکی - بێ گـەردی (العـفـة) ن، کە نابێ شـاعـیـر لە سنووری ئەو سـیـفـاتانە دەربچـێت بۆ وەسـفی شـتی تر لە ستایشکراودا، وەکو وەسفی بەژن و باڵاو جوانی و ڕازاوەیی، بەڵکو ستایشکردنەکە دەبێ چاکەو باسی پێداهەڵدان بێ بەسەر عەقلأ و دادپەروەری و سیفاتی دەروونی چاک و بێگەرد[٢٨].

هەروەها ئەو واژەو زاراوە باوانەی کە شاعیر لە ستایشی خوادا بەکاریان دێنی بەزۆری ئەم زاراوانەن : «بێ نەزیر، بێ هەمتا، بێ بەدەل، بێ شەریک، بێ دار، بێدار، پایەدار...هتد» هەموو ئەو زاراوانەی کە بەدەوری ئەم واتایەدا دەسوورێنەوە بەکاریان دێنێ.

هەروەها ئەو واژەو زاراوانەی کە لە پێداهەڵدانەکانی شیعرەکانی خۆیدا بەکاریان دێنێ بەزۆری ئەوانەن یان ئەوانەی بەدەوری واتای ئەو واژەو زاراوانەدا دەسوورێنەوە ئەوانیش وەکو: «خەزنە، تاقیامەت، نادرێ، مەهی بێ میهری، مەهی سەرکەل، ئافتاب و موشتەری، بەجێ ما نالی، بەپاش کەوت کوردی، حاجی غاری دا، خەزەف، گەوهەر، دوڕڕو مەرجان، مەه، کەلکیان دەگرێ، وەک کاوە، درەفشی هەڵداوە، فیردەوسی کورد، هەمتای نەماوە، خەزینەی گەوهەرو کیسەی دراوە، شوهرەتی ئەبیاتی من»[29]. ئەم واژەو زاراوانەی حاجی کە بەسەر شیعرەکانی خۆیدا هەڵدەدات هەمووی لەدەوری واتای شتی بەهادار دەسوورێنەوە، وەکو ( گەوهەر) و( خەزینە) کە سەروەتێکی زۆر بەنرخی تێدابێ، جگە لەوەی کە بەمانگ و ئەستێرەو ڕۆژیشیان دەچوێنێ، و بەجۆرە بەرگێکی جوان کە کرابێتە بەر کچێکی نازدارو تا قیامەتیش ئەو بەرگە نادرێ و تێک ناچێ.

لە ستایشکردنەکانیش بۆ خەڵکی کۆیە بەزۆری ئەم واژانەی بەکارهێناوە: «ڕۆستەم شەجاعەت، حاتەم، سەخاوەت، غیلمان حوور، نەزەر باز، موسافیر پەروەر، یاری غەریبن، لەهەر عەیبێ بەری بن، چیبایە»[30].

حاجی لە خستنەڕووی ئەو سیفاتانە کە دەیانخاتە پاڵ ستایشکراو دەیەوێ لایەنی ئازایەتی و سوارچاکی و نان بدەیی و غەریب پەروەربیان بخاتە ڕوو، و هەموو واژەو سیفاتەکانی تریش هەر بە دەوری ئەم چەند سیفاتەدا دەسوورێنەوە و جا چ لە ستایشکردنیدا بێ بۆ لاوی کۆیی، یان بۆ هەموو میللەتی کورد، یان بۆ میرو ئاغاو میللەت پەروەرەکانیان بێ ئەو سیفاتانە بۆ هەموویان دەخاتەکار، بەحوکمی ئەوەی کورد هەمووی و هەمیشە بەرەنگاری دوژمنان و هەمیشە لە شەڕدا بووینە، بۆیە سیفەتی ئازایەتی وەکو ڕۆستەم و شێری مەیدان دەداتە پاڵ هەموو کوردێک چ میر بێ یان ئاغا، یان هەر لاوێکی کورد، کۆیی بێ یان خەڵکی شوێنێکی تر بێ لە کوردستان.

ئەمەو سەبارەت بەو واژەو زاراوانەی حاجی هێناویەتیەوە بایەخێکی چاکی بە

واژەکـان داوە، واژەکـانی هەر دێرێک زۆر بەچاکی بۆ یەک شـیـاو و گـونجـاون، هەر پارچە شیـعرێکی ستایشکردنی حاجی هەڵبژێرین، دەتوانین دەستنیشـانی ئەو واژەو زاراوانە بکەیـن کە لەگـەڵ یەک شیـاو و گونجاون بۆ نموونە لەو پارچە شـیـعـرەی کە تیـایدا دەڵێ: (لە ڕۆمـا کـەوتە بەرچاوم) ئەگـەر سـەیری ئەم چەند دێرە بکـەین کـە دەڵێ:

**«لە هارەی شـەش پەڕو نەڕڕەی سـوارو بەرقی شـەشـخـانە**
**لە تەقـقـەی ناڵ و شـەقـقـەی سم، ڕەقـقـەی تۆبزو قـەلغـان**
**دەهاتە جـونبـوش و لەرزین لە مـاهی بگرە تا مـاهی**
**چـوونـە سـەر کـێـوان»** (٣١)

لەم دوو دێرەدا بایەخ بەگـونجـانی واژە دراوە وەکـو دەبینین لە دێری یەکـەمـدا واژەی: «هارە، نەڕڕە، بەرق، تەققە، شەققە، ڕەققە» چۆن لەگەڵ یەکـتـردا گونجـاون هەروەها چۆن لەگەڵ واژەی «شەش پەڕ، سوار، شەشخانە» و لەگەڵ یەکتردا گونجاون و هەندێکیـان ئێجگار نزیک و گـونجـاون لەگـەڵ یەکـتر وەکـو (ناڵ و سم) (تۆبز و قـەلغـان) هەمـووشـیـان بەیەکەوە چ حـەشروحـەلاو بزووتنەوەو دەنـگ و هەرایەکـیـان دروست کـردووە، ئینجـا دی ئەو حـەشـرو هەلەلایە زیاتر بەرجـەسـتـە دەکـات بەخستنەکاری واژەی وەکو: «جونبوش، لەرزین، ترس، چوونەسەر کێوان» و ئینجا واژەی: «سەحرا، کێو، وەحش، ترس» ئەم واژانە چۆن و تا چ ڕادەیەک لەگەڵ یەکتر ڕێک کەوتوون کە هەمـووی جووڵەو چەپووکی و هوشیاری دەنگ و هەراو جووڵەیە، بەمـەش توانـیـویەتی چەندین وێنەی جـوولاو و پانۆرامـا ئاسـا بهـێـنێـتـە بەر زەین و ئەندێشـەی خوێنەر، سەرباری بایەخدان بەواژەو گـونجانیـان لەگەڵ یەکتر، بایەخێکی چاکیش بە واتاو گوزارە دراوە، دەتوانین بڵێین هەردوولا چ ڕوخسـار چ ناوەڕۆک لە یەک ئاستی بەرزی بەکار هاتوون. ئەمە جگە لە گونجان و شیاوییان لەگەڵ یەکتر لە واتاو لە رووکەش، لە ڕووی دەنگەکانیشیـان ئەو شیاوی و گونجاوییە هێندە زەقە بەجۆرێ لە ئاوازو مۆسیقای شیـعرەکەی بەڕادەیێکی سەرنجڕاکێش بەرز کردۆتەوە، گوێگر هەست بەو ئاهەنگ و مۆسیقا بەرزە لە واژەی: (هارە، نەڕڕە، بەرق، تەققە، شەققـە، ڕەققـە، تۆبز، قـەلغـان»دا دەکات کە هەرگـیـز نکۆڵی لەو دیاردەیە ناکرێ، «چونکە ئامانجی شیـعـر ئەوەیە کـە گـەورەترین پایە لە گـونجـانی دەنگەکـان لەگـەڵ یەکـتـردا بهـێـنێـتـە دی، هەروەها ڕووگـەی شـیـعـر دووریـیـە، جـا دووبـارەبوونەوەی

دەنگەکان پێویستە لە دامەزرانی شیعر»[٣٢] ئەمەش لە هێزو تواناو کاریگەری مەبەستی شیعرەکە بەرزتر دەکاتەوەو دواتر ستایشکراوەکە ببێتە مایەی دڵگیری و ئیعجابی خوێنەر یا گوێگر.

لەم ڕووەوە، واتە لەڕووی بایەخدان بەواژە بەم شێوەیە شاعیر دەچێتە ڕیزی شاعیرانی کلاسیکی وەکو نالی و سالم و کوردی، هەروەکو (علاءالدین سجادی) دەڵێ: (قوتابخانەی کلاسیکی هەموو کۆششی خۆی ئەخاتە سەر ژیری – عەقل، عەقل لە ئەدەبەکە یا ئەبێتە فەرماندار، بڕوای خۆی ئەخاتە سەر ڕێزمانی ئەو زمانە، بیرکردنەوە لە گونجاندن و پوختکردنی وشە بەلای ئەوەوە زۆر گرنگە،..»[٣٣]

هەندێ جار حاجی پەنا دەباتە بەر سووککردنی (التخفیف) سەنگی واژە ئەویش بەلابردنی بزوێنێک، یان دەنگێک یان بڕگەیێک، یان بەشێک لە ڕستە، هەروەکو لەم ستایشکردنەیدا کە بەسەر پێشکەوتنی ئەوروپا هەڵدەدا، کە پەندو ئامۆژگاری کوردی مەبەستە و دەڵێ:

**«ئەی خەریکی رمووز و نازو نیاز     ئەوروپا فەنی گەیوەتە ئیعجاز**
**کوورەیی ئەم زەمەنەیان پێوا     خاتری تۆبێ چوونەجەووی سەما»[٣٤]**

شاعیر لە نیوەی دووەمی دێری یەکەم لە واژەی «گەیوەتە» چەند دەنگێکی لابردووە چونکە چاوگەکەی «گەیشتن»ە کەواتە شاعیر لەجیاتی بڵێ: «گەیشتووەتە» دەڵێ: «گەیوەتە» کە لەوانەیە شێوەزاری ناوچەی خۆی بێ، بەمەش دەنگی: «ش، ت»ی لابردووە بەبێ ئەوەی لە کێش و مۆسیقای شیعرەکە لەنگ بکات، بەڵکو شاعیر زیاترلایەنی هێزی و تێکچڕژان و پێکەوە لکانی بەشەکانی زمانەکە و گونجانیان لەگەڵ یەکتر دیار دەکات، گومانی تێدا نییە کە حاجی شارەزای زمانەکەیە دەرکی بەوە کردووە کە لێرە واژەی «گەیوەتە» ئاهەنگی سووکترو ناسکترو خۆشترە لە ئاهەنگ و مۆسیقای «گەیشتووەتە» جا ئەگەر شێوەزاری خۆی بێ یان هی خۆی نەبێ، هەروەها لەنیوەی دووەمی دێری دووەمی ئەو شیعرە واژەی «بۆ» لابردراوە کە بەشێکی ڕستەیەو لەهەمان کاتیشدا بڕگەیەکیشە لەجیاتی ئەوەی بڵێ: «بۆ خاتری تۆبێ» یەکسەر دەڵێ: «خاتری تۆ بێ» ، حاجی لەخۆڕایی واژەی «بۆ »ی هەڵنەگرتووە، بەڵکو بۆ هاوسەنگی و ڕێککەوتنی کێش و ئاوازو مۆسیقای شیعرەکە وای کردووە.

خوێنەری شیعرە ستایشەکانی حاجی تێبینی ئەوە دەکات لە هەندێ لەو ستایشانەیدا توانیویەتی زمانی ئاسای گفتوگۆ بە واژە باوەکانی و دەربڕینە کورتەکانییەوە بەبەرگی ڕەنگینی شیعر برازێنێتەوە گوڕو گڵپەی سیحرو جادووی شیعرییان بخاتە دوو توێی قووڵاییان ئەویش بەدەوری خۆی ئەو سیحرو کاریگەرییە بگوازێتەوە بۆ دەروونی خوێنەرو گوێگر، ئەم دیاردەیە بەزۆری لەو قەسیدەیەدا بەرچاو دەکەوێ کە تێیدا بەشاعیرە کوردەکان هەڵدەدات دیارە کە هەستی نەتەوایەتی بەو زمانە ئاسایەی گفتوگۆ دەربڕیوە کە شاعیر پێوەی ناسراوەو دیارە شیعرو ستایشەکانیشی بە ڕێگەیەک دەچنەوە ئەو هەستە نەتەوایەتییە هەر بۆیەش هەندێ لە دێرەکانی لە قسەکردنی ئاسایی تێناپەڕن.

**«یەکی ڕەنجووری ئەهلی کەرکووکە**
**فیکری بیکری هەموو وەکو بووکە**
**یەکی تریان (ئەمین بەگی) دزەیی**
**دز نییە شاعیرێکە جەربەزەیی**
**بەسیە بێ عاری ئەی گەلی خزمان**
**لەم هەموو بەیتی میللەتی خۆمان**
**ئەگەر ئێمە و سنە و سولەیمانین**
**ناوی یەکیان بەچاکی نازانین**
**بەیتی دمدم کە قەدری نازانن**
**پاکی سیحری حەڵاڵی کوردانن**
**و(مەلکە قۆر) و (حیماری) و (کیسە شکەل)**
**(قس من اسمائهم ولا تسأل)**
**شیعریان جوانە بەس نییە کوردن**
**گەرچی بەدناون و گەلێ وردن**
**بە فیدایان دەکەم ئیبنو یەمین**
**چونکە دەربەستی غیرەتی کوردین»** [٣٥]

ئەم قەسیدەیەی حاجی، ڕا و بۆچوونەکانی (ابن طبا طبا)ی بەتەواوەتی هێناوەتە دی، لەوانەیە زێدەڕۆیی نەبێ گەر بوترێ هەشتا لە سەدا بۆچوونەکانی هاتۆتە دی سەبارەت بەو هۆکارو ئامرازانەی کە پێویستە بەر لە ڕێکخستنی شیعرو هۆنینەوەی شاعیر ئاگادارو شارەزایان بێ، جگە لە بەهرەو ئەندێشەو هەست و سۆزی شاعیرانەو پلەی ڕۆشنبیری شاعیر دەبێ

«زمـانێکی بەرفـراوانی هەبێ و ئەوپەڕی شـارەزایی و تێگەیشـتنی هەبێ لە شیکردنەوەو گێڕانەوەو ئاگاداری هونەرەکانی ئەدەب بێ، زانیاری لە سەرو سەربردەو ڕەچەڵەک و کـارو کـردەوەی خـەڵک بێ و شـارەزایی لە دامـەزراندنی شـیـعـرو تصرفکردن بەواتاکانیان و ڕێبازو سیفات و گوتنەکانیان و هەقایەت و پەندو قسە نەستەقـەکـانیـان و، ئەو دەسـتـوورو یاساو ڕێسایانەی کە لێیـان بۆتەوە، لە درێژە پێدان و پەردە لەسـەر لادان و کورتکردنەوە و جوانی و تام و چێژی وشـەکانیـان و پتەوی و جوانی واتاکانیان و شیرینی بڕگەو بەشەکانیان ... و دوورکەوتنەوەی لە گوتەو واژەی پەڕپووت و واتای ساردو سـووک و لێکچـوونی چەوت و ئیـشـاراتی نامۆو نادیار (مجهول) سیفاتی دوورو دەربڕینی بێ پێزو شەتوپەت و لەنگ، بەڵکو داڕشتـەییێکی خشت ئاساو ملوانکەییێکی ڕێک و جـوان بێ، بەجۆری واتاکـانیش پێش واژەکـانیـان بکەون، دواتر هەستی تێگەیشـتنی چێژ لە واتاکانیـان وەربگرێ وەکـو چۆن گـوێچکە چێـژ لە زەنگ و ئاوازی واژە وەردەگرێ و سـەرواکـانیش وەکـو قالب بن بۆ واتاکانیـان و واژەکان بەبێ زۆری کردن بۆ مەبەستەکە بێن، بەبێ ئەرک و مـاندووبـوون بەنەرمی شـوێنی خـۆیان بگرن و بە ئاسـانیش لە ڕیزگـەکـانیـان دەربچن» [٣٦].

ئەوەی شایانی باسە دیاردەیەکی تر کە لە هەندی شیعرە ستایشەکانی حاجیدا بەدی بکری ڕێزگرتنێکی یەک بەدوای یەک هاتنی ڕووداوی ستایشەکانە وەکو لەم چەند دێرەدا بەدی دەکرێ کە دەڵێ:

**«ئەمـان قـەدری بزانن ئەم کـتـێـبـە**
**لە دنیـا ئێـسـتـەکی هەمـتـای نەمـاوە**
**لە ئەییـامی حـەیاتی شـێـخی خـانی**
**لەسـەر نوسـخـەی خـەتی ئەو نووسـراوە**
**لەلای ئەربابی خـۆی بۆ قـەدرو قـیـمـەت**
**خـەزینەی گـەوهەرو کـیـسـەی دراوە**
**لە مـەجـمـووعی دووەل سـۆران و بۆتان**
**لەسـایەی ئەم کـتـێـبـە ناسـراوە**
**لەکـوردان غـەیری (حـاجی) و (شـێـخی خـانی)**
**ئەسـاسی نەظمی کـوردی دانەناوە»** [٣٧]

حاجی بەم چەند دێرەو هێنانەوەی چەند واژەییێکی هەڵگری واتای کۆن و نوێ

بەهاو پایەی کتێبەکەی دەستنیشان دەکاو مێژوویێکی پڕ بەهاو پڕ لەسەرو سەربردەی سەردەمانێکی دوورو درێژمان دەخاتە بەر زەین و دونیای کۆن تادێتەوە دونیای خۆی، بەمەش سەردەمانێکی مێژووی کوردی پڕ جموجۆڵمان دێنێتەوە بەرچاو، ئەو واتا چڕو پڕو بەگوڕانەش لە واژەی «کتێب، دنیا، ئەییام، حەیات، نوسخەی خەت، ئەرباب، خەزینە، مەجمووعی دووەل، کورد، نەظم...» دا بەدی دەکرێن.

ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی سەیری ئەم قەسیدەیە بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە حاجی مرۆڤێکی ڕۆشنبیری مەوسوعی بووە، چونکە زانیارییێکی تەواوی لە سەروسەربردەی مێژووی میللەتی خۆی و کەلتوورو ئەدەبیات و شارستانیەتی نەک تەنیا میللەتی خۆی، بەڵکو ئاگاداری میللەتەکانی تریش بووە، و بەهۆی ئەوانیشەوە تاڕادەیەک زانیاری هەبووە سەبارەت بەشارستانیەت و مێژووی بێگانە.

هەروەها ئەو واژەو زاراوە زانستی و زانیارییانەی لەم ستایشکردنەدا بەکاریان دێنێ ئەوەش بەڵگەیەکی تری ڕۆشنبیری حاجی وەکو مەوسوعە نیشان دەدات، جگە لەوەی کە هەر ئەم واژە بەرزو ناوە پڕ واتاو عیلمییانە هۆکارێکی تری کاریگەری شیعرەکەن بۆ سەر خوێنەرو گوێگر، کە خۆیان لەخۆیان هەڵگری واتای ستایشکردنن، واژەی بەهێزو زانستی و هونەرین وەکو «شەهسەوار، بەلاغە، فەصاحە، غەزەل، عەرصە، ئوستاد، فیکر، بیکر، جەربەزە، کتێب، شوعەرا، بەیت، کەلاوەی دەهر، غیرەت، مورشیدی ئەرشەد، مەدح، مەقصەد، فەضایی عیللیین، عاجیز، تەعداد، مەعدەن، عیلم، عالیم، عامیل، کامیل، دەوران، ڕەواق، مەزهەب، خالص مەشرەب، ئەوزان، مەلکە مووتی مەعنا، ئابی حەیات، فلاتوون، لەفز، باعیسی عەیش، دافیعی کەدەر، طەبعی مەوزوون، تیژی زوبان، نووکی ڕم و دەمی خەنجەر، بێ حەدو پایان، مەعلوم، زاهیری جاهیل، باطینەن، کامیل غەڕرا، مەثنەوی، قابیل لایق، بێ صەدا، ئیرتیجالی، فەرد، تەحسین، موعەللیم، نووسین، مەلای دەرس، موفتی ئوممەت، بێ غیرەت، بێ عار، قەید، تەذبیب، شەرح، حاشیە، سەدر، مەعاریف، تەخمین، کرمی ئاوریشمین، مێش هەنگوین، ڕۆمی، نەسناس، موتعە، مەوهووم ... هتد»[٣٨] و ناوی دەیان کتێب و دەیان شاعیری کوردو غەیری کوردیش دێنێ.

دەبێ ئاماژە بەوەش بکرێ کە شاعیر لە ستایشکردنەکانیدا بەزۆری سیفەو

مەوسوف بەکاردێنێ و بەشێوەی (موزاف و موزاف الیە) و دەیانخاتە پاڵ یەکتر ئەویش بەزۆری بەهۆی ئامرازێکی پەیوەندی وەکو (ی) و لەم دێرانە دەبینرێ کە دەڵێ:

**«(نالی) ئوستادەکی گەلێ چابوو**
**خضری ئاوی حەیاتی مەعنابوو»** (٣٩)

یان کە دەڵێ:

**«لە کون و قوژبنی کەلاوەی دەهر**
**چەندی تر هەن میپالی گەنجی گوهر»** (٤٠)

هەندێ جاریش بە ڕێگەی سیاقی ڕستەکە واتای وەسف و پێداهەڵدانەکە دەردەکەوێ، وەکو ئەوەی لەم دێرەدا دەبینرێ کە دەڵێ:

**«شیعریان جوانە بەس نییە کوردن**
**گەرچی بەدناون و گەلێ وردن»** (٤١)

حاجی ڕێگەییێکی تایبەتی سنوورداری بۆ ستایشەکانی نەکردۆتە چوارچێوەییێکی دیارو لەو سنوورە دەرنەچووبێ، بەڵکو بەهەر ڕێگەیەک هەستی کردبێ مەبەست دەپێکێ لێی دوودڵ نەبووەو هونەرمەندی خۆی بۆ خستۆتە کار، هەروەها وەکو زۆربەی شاعیرانی تر کە وەسفی لایەنی چاکی ستایشکراو دەکا، بەزۆری وەسفی هەموو دەدات بە بەش (واتە وەسفی کوللی دەدات بە جزء)، یان چەند سیفەت دەدات بە مەوسووفێک بۆ نموونە لەو چەند دێرەدا دەڵێ:

**«شەهسەواری بەلاغەتی کوردان**
**یەککە تازی فەصاحەتی (بابان)**
**مستەفایە تەخەللوسی کوردی**
**غەزەلی کردە بەربوتی کوردی**
**ناوی صاحێبقرانی خاصی ئەوە**
**چونکە لەم عەرضە ئەسپی ئەو بەدەوە»** (٤٢)

لێرەدا شاعیر هەموو سیفەتەکانی (بەلاغەت) و (فەصاحەت)ی داوە بە شیعری مستەفا بەگی کوردی. دیارە کە (بەلاغەت و فەصاحەت) لە چەندین جوزئیاتی ورد ورد پێک دێن، حاجیش هاتووە بە جارێک بەم دوو زاراوەیە واتە زاراوەی (بەلاغەت و فەصاحەت) چڕی کردوونەتەوەو کردوونیەتە سیفاتی شیعری

مستەفا بەگی کوردی، ئەمەو واتای ئەم دوو بابەتە هونەرییە وردو فراوانەی زمان، حاجی شیعرەکانی ئەو شاعیرە فراوانتریش دەکات، کە پەنا دەباتە بەر سیفەتی (شەهسەوار) واتە کە لە مەیدان چەندین سوار هەبێ، ئەو شاهی هەموویانە و لە سەرووی هەموویانە، ئەو شاعیرە لەم مەیدانەدا لە هەموو سوارەکانی مەیدان چەپووکترو بەگورترە، دەستی لە هەموویان بردۆتەوە، بەمەش هەموو سیفاتێکی چاکی لە وردە سیفاتەوە بگرە تا درشت و گەورەو بەهێزو پتەو دیار دەکات هیچیان ناهێڵێتەوە، هەمووی دەداتە پاڵ شیعرەکانی مستەفا بەگی کوردی. حاجی دەیەوی بەمە پلەو پایەی حەقیقی شیعری ئەم کەڵە شاعیرە بۆ خوێنەر یان گوێگر دیار بکات ، و تارادەیەکیش ئەو حەقیقەتەی پێکاوە. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر تەرتیبی ڕێکخستنی واژەکانی، دەبینین زۆر زانایانە واژەو زاراوەکانی کە هەڵیبژاردوون، جگە لە هەڵبژاردنە نایابەکەی، بەشێوەییێکی ئێجگار سەرنجڕاکێش بەدوای یەکیدا هێناون، کە لە خوێندنەوەیان مرۆڤ ناکەوێتە گرفت، چونکە لەسەر زمان سووک و خۆشڕۆن، وەکو ڕێزبەستنی واژەو زاراوەکانی «شەهسەواری، بەلاغەتی، یەککە تازی، فەصاحەتی، تەخەللوسی، غەزەلی، بەربوتی، کوردی، صاحێبقران، خاص، ئەسپی... هتد»[٤٣].

ئەگەر لەڕووی ڕێککەوتنی و گونجانی دەنگەکانی و کاریگەرییان بۆ سەر هێزو توانای گوزارە لە لایەک، لە لاییکی تریش پێکهێنانی سازو ئاوازێکی تارادەیەک دڵگیر وەکو ئەم دێرە بەهۆی دووبارەکردنەوەی دەنگی (ع، ی، م، ل)دا دەبینرێ کە حاجی دەڵێ:

**«مەعدەنی عیلم و عالیمی عامیل**
**قوطبی دەوران و موڕشیدی کامیل»**[٤٤]

دیارە ئەمەش لە پلەو پایەی ستایشکراو زیاتر بەرز دەکاتەوە، هەروەها ئەو دێرە شیعرانەی حاجی سەبارەت هونەری ستایشکردن، هەردوو جۆر لە زمانی تێدا بەدی دەکەین لە زمانی گفتوگۆی ئاسایی تا دەگاتە ئەوپەڕی زمانی هەڵبژاردەی شیعر، حاجی لە هەردووکیان شارەزاو هونەرمەندە، ئەمەش لە کاریگەری شیعرەکانیدا بۆ سەر خوێنەرو گوێگردا دەردەکەوێ، ئەم دێرانە ئەم قسەیە دەسەلمێنن:

| | |
|---|---|
| **«شەهسەواری بەلاغەتی کوردان** | **یەککە تازی فەصاحەتی (بابان)** |
| **مستەفایە تەخەللوسی (کوردی)** | **غەزەلی کوردە بەربوتی کوردی** |
| **ناوی صاحێبقران خاصی ئەوە** | **چونکە لەم عەرچە ئەسپی ئەو بەدەوە** |
| **ئەو کە نۆشی شەرابەکی تاڵی** | **(نالی) لەو عەرصەدا بووە (تالی)** |

**دەشـتی کـەرکـووک و کـێـوی هەورامـان** **شـــاعـــیـــری زۆرە بێ حـــەدو پـایان**
**ســـادە هەر ناویـان بکەم ئیـــمـــلا** **ئەم کـتـێـبـە بچـووکـە بەش ناکـا**
**بەسـیـە بێـعـاری ئەی گـەلی خـزمـان** **لەم هەمـــوو بەیتی مـــیللەتی خـــۆمـــان**
**ئەگـــەر ئێـــمـــە و سنە و ســولەیمانین** **ناوی یەکـــیـــان بەچاکی نـازانین»[٤٥]**

هەروەها ئەوەی تێبینی دەکرێ لەو قەسیدەی کە بەشاعیرە کوردەکان هەڵدەدات، ئەو واژانەی کە بە دەوریدا دەسووڕێتەوە، واژەی (ئوستاد) و هاوچەشنەکانیەتی وەکو «ئوستاد، مورشید، عالیم، عامیل، وەستا، حیکمەت، فەصیح، کامیل، موعەللیم، موفتی» هەروەها واژەی (شاعیر) یازدە جار دووبارە دەکاتەوە، قەسیدەکە پڕە لەو واژانەی کە تەعبیر لە شاعیریەت و عیلم و هونەرو فەصاحەت و ئوستادی دەکەن لەو مەیدانە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنی کە وا پەیوەندییێکی قووڵ و بەهێز لەنێوان واژەو فیکردا هەیە.

**شێوازی بینای پێکهاتنی زمانەکەی**

بە چاو پێداخشاندنێک بە شێوازی بینای پێکهاتنی باوی زمانی شیعرە ستایشەکانی حاجیدا، ئەوەی تێبینی دەکرێ، شێوازی هەواڵدانە حاجی دەڵێ:

**«خەزنەیێکە بەیتی من دوو میصرەعم داخستووە**
**کەس تەماعی تێ نەکا ڕێگای دزم لێ بەستووە**
**بیکە بەر دیبایی نەزمم تا قیامەت نادڕێ**
**چونکە ئەبکاری مەعانی تارو پۆیی رستووە»[٤٦]**

یان دەڵێ:

**«هەروەکو شارانی تر کەس ئاشنای کۆیێ نەبوو**
**شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵکی لەسەر کۆکردەوە»[٤٧]**

هەروەها کە دەڵێ:

**«حاکم و میرەکانی کوردستان**
**هەر لە بۆتانەوە هەتا بابان**
**یەک بەیەک حافیظی شەریعەت بوون**
**سەییدی قەوم و شێخی میللەت بوون»[٤٨]**

بەشێوەیەکی گشتی شێوازی هەواڵدان زیاتر ئیحای ڕاستگۆیی بە خوێنەر یان گوێگر یان ئاراستەکراو دەبەخشێت، دیارە مەبەستی (حاجی)ش لە خستنەڕووی ستایشەکانی لەسەر شێوازی هەواڵدان، چەسپاندنی ئەو ڕاستگۆییەیە، بەمە

دەیەوی قەناعەتێکی کوللی بە خوێنەرو گوێگر بێنێ کە ستایشکراوەکەی بەڕاستی شایەنی ئەو سیفاتانەیە، نەک هەر ئەوە، بەڵکو بەحەقیقەت هەڵگری ئەو سیفاتانەیە، تەنانەت هەندێ جار هێندە پێ لەسەر ڕاستگۆیی حەقیقەتی ئەو سیفاتانەی ستایشکراو دەکا، کە هیچ گومانی تێدا ناهێڵێتەوە کە هەموو کەس دان بەو حەقیقەتە بڵاوە دادەنێ، ئەویش بە هێنانەوەی واژەی «خۆ دەزانن» کە بەم واژەیە تەئکیدی زیاد لەسەر حەقیقەتەکە دەکات، بەوەی کە ئەو سیفاتانەی کە شاعیر بۆ ستایشکراوەکەی هێناوەتەوە، هەموو کەس عیلمی پێ هەیە، وەکو لەم پارچەیەدا دەڵێ:

**«خۆ دەزانن سولالەیی ئەکراد**
**لێرەوە بگرە تا دەگاتە قوباد**
**هەموو عالیم، هەموو شێخ و میرن**
**زیرەک و ژیرو ئەهلی تەدبیرن**
**شەهسوارن، پیادەیان ئازان**
**بەردی نیشان و کۆلکی مەیدان**
**دان و بەخشینیان لە لا باوە**
**خوونی مەیدانیان لەکن ئاوە**
**بە شەجاعەت هەموو وەکو ڕۆستەم**
**بە سەخاوەت هەموو وەکو حاتەم**
**لە وەفا سەموئیل و ئیسماعیل**
**عەهدو پەیمانیان چیای قەندیل»** [49]

هەروەها جگە لە واژەی «خۆ دەزانن» کە گومان ناهێڵێتەوە، حاجی بۆ زیاتر تەئکید بوونی گوێگرو خوێنەر لەسەر ئەو حەقیقەتە ڕاستانەی کە لە ستایشکراودا هەن لە سیفەت و کارو کردەوەی چاک بەدەستەواژەیێکی زیاتر بەرچاو دەهێننەوە کە ئەویش بانگکردنی خەڵکە بۆ ئەوەی بەچاوی خۆیان ئەو ڕاستگۆیی و حەقیقەتە ببینن، وەکو لەو ستایشانەی کە بەسەر لاوی کۆییدا هەڵدەدات، بە دەستەواژەی «وەرە سەیری بزانە» دەست پێ دەکاو دەڵێ:

**«وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی**
**مەهە دانیشتووە یا سەروە ڕۆیی**
**هەیاسەو پەستەکی لای نێوەشانی**
**کەوای شێرداغ و فێس و جامەدانی»** [50]

له هێنانەوەی کارەکانیش (افعال)دا، شاعیر کاری ڕابوردوو، ڕانەبوردوو بەکاردێنێ لەم بەکارهێنانەشیدا شاعیر دەیەوی ئاماژە بەوە بکات کەوا هەر لەکۆنەوەو لەکاتی ڕابوردووش ستایشکراوەکەی بەچاکەو چاکەکاری ناسراوە، ئەم چاکەو فەزیلەتانە وەکو خووڕەوشتێکی عادەتی بووینەو ئەوساش و ئێستاش و لە داهاتووشدا، واتە هەمیشە هەر لەگەڵیایەتی و لێی جیا نابێتەوەو بەردەوامیشە لەسەریان، ئەم چەند دێرە ئەو قسەیە دەسەلمێنن کە حاجی تیایاندا دەڵێ:

**«حـــاکم و مـــیــــرەکــــانی کـــوردســـــتـــان**
**هــــەر لـــە بـــۆتــــانـــەوە هـــەتـــا بـــابـــان**
**یەک بەیەک حــــافـــیظی شـــــەریعـــــەت بوون**
**ســـەییـــدی قـــــەوم و شــێــخی مـــیللەت بوون**
**شــــێـــــری دڕڕوندە وەک لە بێـــــشـــــە نەمـــا**
**گـــورگ و مــــام ڕێوی دێنە ڕەقس و ســـەمـــا »**(٥١)

شاعیر بە( کاری ) ڕابوردوو، ڕانەبوردوو پێ لەسەر سیفاتی چاکی حاکم و میرە کوردەکانی کوردستان دەکات و واش نیشان دەدات کە ئەو حاکم و میرانە تا مردنیان هەر بەردەوام بووینە لەسەر ئەو خووڕەوشتە چاکانە، کە ئەوان نەمان ئینجا ڕیایی سەییدو شێخە ڕیاکارەکان دەرکەوت.

هەروەها شێوازێکی تریش لەو شیعرانەی حاجیدا بەدی دەکرێ کە ئەویش شێوازی (مەرج )ە، بەم شێوازە شاعیر دەیەوی دیاری بکات کە ئەو سیفاتانەی دابووی بە ستایشکراو ڕاست بوون و سروشت و سیفاتی حەقیقی خۆیان بوون، ئەگینا دوای نەمانی ستایشکراو کە (میرە کوردەکان) بوون کاروباری وڵات وا شلۆق نەدەبوو، حاجی لەم دێرە پەند ئاسایە کوردییەدا ئەو شێوازە دەردەبڕێت کە دەڵێ:

**«گـــــەر لە ســــەحــــرا مــــەلا نەمــــردایە**
**گـــــورگــــە شێن با کــــەری بخــــواردایە»**(٥٢)

ئەمەو جارجارەش شێوازی بانگهێشتن دەخاتە کار، شاعیر ئاڕاستەی ستایشکراوی دەکات بەیارمەتی ئامرازی بانگهێشتن ( ئەی )، ئەمەش لەگەڵ شێوازی دواندا نزیک دەبێتەوە، ئەوەشیان بۆ سەرنجڕاکێشان و ئاگادارکردنەوەیەو هەروەها باسی ڕاستی و حەقایقی رەوشتی ستایشکراو دەکات، ئەم شێوازە لەو

چوارینەیدا بەدی دەکرێ کە تیایدا بەسەر (حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە)دا هەڵدەدات و دەڵێ:

**«ئەی عوتارید لەدەرت خادیمی سەجادە بەشان**
**وەی لە کۆیی فوصەحادا قەڵەمت سنجقە شان**
**(حاجی) قادر نییە بەیتێکی وەکو ئێوە بڵێ**
**ئەسپی کۆن زەحمەت دەرچێ لەگەڵ ئاهوو ڕەوشان»** [٥٣]

شاعیر کە ستایشی خوای گەورە دەکات شێوازی پەنابردنە بەرو پاڕانەوە و نزاو دوعاکردن بەکاردێنێ بۆ ئەوەی بە هەموو توانای خۆی هێزو دەسەڵاتی حەقیقەتی مەزن و هەمیشەی ئەو دەسەڵاتە بۆ خوێنەر دەربخات و بێ هێزی ئادەمیزاد و پێویستی بە پشتیوانی دەسەڵاتی خوا بخاتە ڕوو هەروەک لەم پارچە غەزەلە نایابەیدا دەبینین کە دەڵێ:

**«ئەی بێ نەزیرو هەمتا هەرتۆی کە بەرقەراری**
**بێ دارو بێ دیاری ، بێ دارو پایەداری**
**بۆ باغی مەردی باغی سەرمایەکەی بەهاری**
**خەللاقی بێ فتووری، سوڵتانی بێ قسووری**
**ڕەززاقی مارو مووری، ئاودێری دێمەکاری»** [٥٤]

لێرەدا دەردەکەوێ کە شاعیر تا لە توانایدا بووە دەسەڵاتی خوای مەزن دەردەخات، کە هەموو حەقایق و ڕاستین بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە مبالەغەیێکی کردبێ، نەک هەر مبالەغەی نەکردووە بەڵکو ئەم واژانەی کە بەکاری هێناون هێشتا دابینی هەموو حەقیقەتەکە ناکەن چونکە خودی زمان ئەگەر بەهەموو جۆرو هونەرەکانی کە هەن بیانخاتە کار نەک حاجی هەموو شاعیرانی جیهان بەهەموو زمانەکان ناتوانن تەنیا دڵۆپێک لە کونهی دەسەڵات و سیفاتی خوای گەورە تەعبیر بکەن، چونکە هەموومان دەزانین کە (لیس کمثله شيء).

## ئەنجام

شیعرە ستایشەکانی حاجی دوو ڕووگەیان هەیە یەکێکیان شاگەشکە بوونە بەکارو کردەوەی بەرزی خاوەنەکانیان، لەم جۆرەیاندا شاعیر مەبەستی چاککردنی باری کۆمەڵایەتییەو هەشیارکردنەوەی ویژدانە.

ڕووگەی دووەمی ستایشەکانی لەسەر بنەمای هەستی نەتەوایەتی دامەزراوە کە هەمیشە لە بەرژەوەندی میللەتەکەیدایە، ئەم جۆرەیان لە شیعرە سیاسییەکاندا بەدی دەکرێ.

– حاجی پارچە شیعرێک یان قەسیدەیێکی سەربەخۆی نییە کە لە سەرەتایەوە ستایش بێ تا دوا دێری قەسیدەکە، تەنیا ستایشە ئایینییەکانی نەبێ کە تیایاندا ستایشی خواو پێغەمبەر دەکات.

واتە شیعرە ستایشەکانی حاجی تاک تاکن لەناو قەسیدەیەک یان غەزەلێکدا بەدی دەکرێن کە شاعیر تیایاندا ستایشی هەموو چین و توێژەکانی، هەموو شوێن و زێدی وڵاتەکەی دەکات تەنانەت ستایشی شیعرەکانی خۆشی دەکات.

– واژەو زاراوەکانی شیعرە ستایشەکانی حاجی ئاسایین و نامۆ نین، دیارە واژەو زاراوەی ئەو شیعرانەی کە تیایاندا ستایشی خواو پێغەمبەر دەکات بەزۆری عەرەبین و تام و چێژی ئایینیشیان زۆر پێوە دیارە، کە ئەوانیش وشە و زاراوەی پڕ ڕێزو تەقدیر وەکو سیفەتی بەرز بۆ ستایشکراو بەکار هێناوە، هەر لەم جۆرە ستایشانەیدا جگە لە سەروا پڕ ئاوازە بەهێزەکەی جۆرە سەجعێکی دڵگیریش لەناو ڕستەکاندا بەدی دەکرێ کە لە ئاهەنگی شیعرەکەیان بەرزتر کردۆتەوەو لە کاریگەرییەکەشیان زیاتر کردووە.

– ئەو سیفاتانەی حاجی داویەتیە پاڵ ستایشکراو هیچیان سنووری ڕێزو پایەی ستایشکراوەکەیان نەبڕیوە، واتە شاعیر لەو پێوانەیە دەرنەچووە کە چوار سیفاتی چاکن لە (هۆشمەندی و ئازایەتی و دادپەروەری و پاکی و بێ گەردی) هەموو واژەکان یان ئەمانەن یان بەدەورەی ئەمانەدا دەسووڕێنەوە.

– حاجی بایەخی بە گونجانی واژەکان داوە یەک لەگەڵ ئەوەی تر، لەمەش زیاتر حاجی بەهۆی ئەم گونجانەیان لەگەڵ یەکتر بەزم و هەرایەکی ئێجگار سەرنجڕاکێشیان دروست کردووە کە نزیکە لە ڕاستی ڕووداو و کە چەندین وێنەی جووڵاو و پانۆراما ئاسا بهێنێتە بەر زەین و ئەندێشەی خوێنەر.

- هەندێ جار شاعیر بۆ سووککردنی (تخفیف) سەنگی واژەکان و زیاتر گونجانیان دەنگێک یان برگەیەک لادەبات، ئەمەش وای کردووە کەوا کێش و مۆسیقای شیعرەکە خۆشڕۆترو ئاوازەدارتر بکات، بۆ ئەمەش شاعیر پەنای بردۆتە بەر زمانی ئاسایی گفتوگۆ، بەواژە باوەکان و دەربڕینە کورتەکانیەوە گڕوگڵپەی شیعرییان بخاتە دوو توێی شیعرەکەو لەوێشەوە بۆ خوێنەر.

- حاجی بە بەکارهێنانی ئەو واژەو زاراوانەی کە واتای زانست و زانیاری دەنوێنن نیشانەی رۆشنبیری شاعیر وەکو مەوسوعەیەک دەسەلمێنن.

- شاعیر لە وەسفەکانیدا بۆ ستایشکراودا هەروەها بۆ پێکهێنانی مەبەست وەسفی کوللی دەدات بە جزء.

**پەراوێزەکان**

(١) دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، کەریم مستەفا شارەزا، پێداچوونەوەی: مەسعود محەمەد، ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، ١٩٨٦، ل ١٤٣.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٨.

(٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٢.

(٤) دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٢١١.

(٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٠.

(٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٥ ، ١٠٦ - ١٠٧.

(٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٣.

(٨) سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٨.

(*) مەبەست لە کلاسیکی ئەوروپی نییە بەڵکو مەبەست لە لاساییکردنەوەی ڕوخسارو ناوەرۆکی شیعری میللەتانی رۆژهەڵاتی موسوڵمانە وەکو تەوزیفکردنی قاڵبە شیعرییەکانە وەکو غەزەل، قەسیدە، مولەممەع، تەرکیب بەند و تەرجیع بەند، موستەزاد، .....هتد. هەروەها بەکارهێنانی کێشی عەرووزی عەرەبی و یەکێتی قافیە.

(٩) دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران ، ل ١٣٠.

(١٠) فن الشعر، الدکتور احسان عباس، بیروت - لبنان، الطبعة الاولی، دار صادر - بیروت، دار الشرق - عمان، ١٩٩٦،ص ١٠٦.

(١١) دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ١٤٣.

(١٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٧.

(١٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٧.
(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٨.
(١٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٧.
(١٦) فن المدح، احمد ابو حاقة، منشورات دار الشرق الجديد، بيروت، الطبعة الاولي، اذار، مارس، ص١٩٦٢.
(١٧) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران، ل ١٤٣.
(١٨) العمدة في محاسن الشعر وآدابه ونقده، ابي علي الحسن بن رشيق القيرواني الازدي، حققه وفصله وعلق حواشيه: محمد محي الدين عبداالحميد، الطبعة الرابعة، دار الجبل، بيروت - لبنان، ١٩٧٢، ص ١٢٨.
(١٩) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٧١، ٨١، ٨٤، ٩٢، ١٠٦، ١٠٧، ١٢٧، ١٤٥، ١٤٦، ١٤٧، ١٥٧، ١٥٨، ١٧٣، ١٧٥، ١٨٠، ١٨٦، ١٩٠، ١٩٤، ١٩٥، ١٩٦، ١٩٧، ١٩٩، ٢٠٩، ٢١١، ٢١٣، ٢١٤، ٢١٩، ٢٣١، ٢٤٥، ٢٤٦، ٢٥٣، ٢٥٩، ٢٦٧.
(٢٠) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٥.
(٢٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٧.
(٢١) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٣.
(٢٣) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران ، ل ١٤٣.
(٢٤) الافكار والاسلوب، ا. ف تشتشرين، ترجمة د. حياة شرارة، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٣٩٨هـ - ١٩٧٨، ص ١٩.
(٢٥) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران، ل ١٩٩.
(٢٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١١.
(٢٧) سەرچاوە پێشوو، ل ٢١٣.
(٢٨) بڕوانە: نقد الشعر، لابي الفرج قدامة بن جعفر، كمال مصطفى، مكتبة الخانچي، مصر، المثنى - بغداد، ١٩٦٣، ص ٣٩- ٤١، ٢١٥.
(٢٩) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران، ل ١٣٠، ١٧٣، ١٧٥، ١٨٠، ١٩٠، ١٩٤، ٩٥، ١٢٧.
(٣٠) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٢، ٢٥٣.
(٣١) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٩٢.
(٣٢) نظريات البنائية في النقد الادبي، د. صلاح فضل، الطبعة الثالثة، بغداد، ١٩٨٧، ص ٣٦٩- ٣٧٠.
(٣٣) نرخ شناسی، علاءالدين سجادی، ٢٦٦٩ ک - ١٩٦٩ م، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ل ٦٣.
(٣٤) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران، ل ١٨٦.
(٣٥) ديوانی حاجی قادری كۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٢١٩، ٢٢٠، ٢٢٤، ٢٢٥.

(٣٦) عيار الشعر، ابي طباطبا العلوي، تحقيق: طه الحاجري و د. محمد زغلول سلام، المكتبة التجارية الكبرى، القاهرة، ١٩٥٦،ص٥.
(٣٧) ديوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ١٠٦ - ١٠٧.
(٣٨) ديوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٢١٩، ٢٢٠، ٢٢١، ٢٢٢، ٢٢٣، ٢٢٦، ٢٢٧.
(٣٩) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٩.
(٤٠) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٠.
(٤١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٠.
(٤٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٩.
(٤٣) ديوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٢١٩.
(٤٤) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢١.
(٤٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٩، ٢٢٤.
(٤٦) ديوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ١٣٠.
(٤٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٧.
(٤٨) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٣.
(٤٩) ديوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٢١١.
(٥٠) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٧.
(٥١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٣، ٢١٤.
(٥٢) سەرچاوەی پشوو، ل ٢١٤.
(٥٣) ديوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، ل ٢٦٧.
(٥٤) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٣.

## ملخص البحث

## لغة شعر المديح عند حاجي قادر الكوئي

د. خانزاد علي قادر
قسم اللغة الكردية / كلية التربية
جامعة صلاح الدين- اربيل

يعود تاريخ ظهور فن المديح في الادب الكردي الى زمن بعيد ، هذا ما تثبته النتاجات الفولكلورية الكردية. وهو ما يتبين من اللمحات اللطيفة التي استخدمها الشاعر في اغنياته المدائحية، فضلا عن المعنى العميق الجميل وهذه هي الصفات الاساسية لشعر المديح عموما فضلا عن الاتيان بالصور اللطيفة.

يبحث الموضوع عن لغة الشعر المديح عند (حاجى قادرى كوئي) وهو يتألف من مقدمة مع عرض المصطلح المديح والاتجاه الذى سلكه الشاعر في اشعاره . ومن هنا تم عرض لمصطلحات اشعاره مطولا.

حاول الباحث ان يتغلغل الى عالم شعر المديح عند الشاعر والتأمل في مصطلحاته وكيف انه استحضر صوراً جميلاً باستخدام هذه اللغة الاعتيادية: وأي لذة قدمها للقاريء. فالشاعر استطاع ان يوظف اللغة الاعتيادية، المستخدمة في الحياة العامة الكردية توظيفاً خاصاً بحيث تبدو كأنها لغة جديدة مختلفة وان بدا عليها بعض السطحية في بعض الاحيان.

وقد حاول الباحث ان يوضح بنية الكلمات وتلاؤمها مع بعضها فضلا عن ملاءمتها مع الوزن والقافية.

# Abstrat

## Praising in the Poems of (Haji Qadri Koiy)



**Dr. Khanzd Ali Qadir**

**College of Education For Human Sciences**

**Salahaddin University- Erbil**



**The Kurdish folk works proves that the history of praising poems among Kurds, belongs to an early period.**

**This research paper, studies the poetic language of Haji Qadir's praising poems.**

**Apart from the introduction and conclusion, the body presents the concept of praising poem and Haji Qadir's perspective about this kind of poem in detail, the research sheds light on Haji's poetic world, his simple language, through which the poet has create many kinds of unfamiliar poetic images**

**Haji borrows most of his words and vocabularies from Kurdish everyday language, his rich experience in language results in a very beautiful style.**

**The research shows the general structure of the words and their harmony with each other and the consistency with the rhyme and rhythm of the verses.**

# عەشیرەتی سوورچی
# لێکۆڵینەوەیێک لە ئەتنۆ ـ جوگرافیادا

د. عەبدوڵڵا غەفور
کۆلێژی ئاداب . بەشی جوگرافیا
زانکۆی سەلاحەدین . هەولێر

**ئامانجی لێکۆڵینەوە**

سیستەمی عەشایری، لە ئەنجامی گۆڕانکاریی سیاسی وەکو، شۆڕشی چواردەی تەمموز (١٩٥٨) و شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١) و ڕاگواستن (١٩٦٣ـ١٩٩١) و ڕاپەڕین (١٩٩١) و دامەزراندنی حکوومەتی هەرێم (١٩٩٢) و ئاڵوگۆڕی سیاسی (٢٠٠٣) و ململانێی حزبایەتی و گۆڕانکاریی ئابووری وەکو، خزین بۆ ناو کەرتی خزمەتگوزاری (پێشمەرگایەتی و زێرەڤانی و فەرمانبەری) و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی وەکو، جێهێشتنی گوند و لە شار نیشتەجێبوون. ئەمانە بە سەر یەکەوە سیمایێکی تازەیان جودا لە سیمای ترادیسیۆنییان بە سیستەمی عەشایرییان لە باشووری کوردستاندا، بەخشیوە.

ئەو توێژینەوە بۆ شێکردنەوەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی کولتووری مادی و گیانی سوورچییەکان لە ناوچەی بادینان و سۆران تەرخان کراوە. هەروەها هەندێک لەو گۆڕانکارییانەی بەسەر ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەی هاتووە.

توێژینەوەکەم مەیدانییە. بەر لەو کارەی منیش، هەر نەبێ لە لایەنی ئەتنۆ ـ جوگرافیادا، لەسەری نەنووسراوە. بۆ ئەو مەبەستە، پێنج سەردانی مەیدانیم. لەسەر حسابی خۆم، کردووە. دووشەممە ٦ تشرینی یەکەم و چوارشەممە ١٠ کانوونی یەکەم

ساڵی ٢٠٠٨ و یەک شەممە ٧ شوبات و هەینی ١٢ شوبات و هەینی ١٩ شوبات ساڵی ٢٠٠٩ و دووشەممە ٩ مارت ساڵی ٢٠٠٩ بۆ ناوچەی سوورچییان لە بادینان و سۆران کردووە. جگە لە سەردانی چەند کەسێکی سوورچی دانیشتووی شاری هەولێر و شوێنی دیکە (*).

توێژینەوەی ئەتنۆ ـ جوگرافی، لە باشووری کوردستاندا، لەبەر ئەوەی لەو ساڵانەی دوایی دەستی پێکراوە، مەیدانێکی بەرفرەوانی لە پێشە. هەر بۆیەش چەندی لەسەر بنووسرێ ئینترێسی خۆی وەکو زانست لە دەست نادات.

## ١. هەندێک لایەنی جوگرافی ناوچەی عەشیرەتی سوورچی

### دیاریکردنی ناوچەی لێکۆڵینەوە

ناوچەی لێکۆڵینەوە یان ناوچەی عەشیرەتی سوورچی، ناوچەیێکی فرەوانی لە قەزای شەقڵاوە و ئاکرێ لە پارێزگای هەولێر و دهۆک گرتووە. لە باکووردا ـ ناحیەی گۆڕەتوو و ناحیەی نەهلە. لە باشووردا ـ ناحیەی هیران و ناحیەی شەقلاوە و ناحیەی سەلاحەدین. لە رۆژهەڵاتدا ـ ناحیەی بێتواتە و ناحیەی رواندز. لە رۆژئاوادا ـ ناحیەی قەسرۆک.

ناوچەی عەشیرەتی سوورچی لە رووی ئیدارییەوە، چەند ناحیەی لێ دروست کراوە. ناحیەکان بە گوێرەی دابەشبوونی ئیداری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی دوو هەزار و نۆدا ئەمانە بوون: هەریر و باسرمە و خەلیفان و بجیل و گردەسێن.

زێی بادینان (زابی گەورە)، ناوچەی عەشیرەتی سوورچی بۆ دوو ناوچەی جوگرافی ـ قەبیلەیی دابەش دەکات. بەشی دەستەراستی بە ناوچەی سۆران (بە بادینی صۆرا) و دەستەچەپی بە ناوی ناوچەی بادینان ناسراوە.

---

* سەفەرەکانم بە یاوەری حەدێ و کاوە و ئازاد (قوتابییانی بەشی جوگرافیا) و موراد حەکیم (مامۆستا لە بەشی کۆمەڵناسی کۆلێژی ئاداب) و بێستون (قوتابی بەشی کۆمەڵناسی ئێواران) بووە. سوپاسیان دەکەم.

### سنووری عەشیرەتی سوورچی

تریتۆریی عەشیرەتی سوورچی لە چوار لاوە بەو شێوەیە. لە باکووردا ـ عەشیرەتی هێرکی (هەرکی). لە باشووردا ـ عەشیرەتی زێباری. لە رۆژهەڵاتدا ـ عەشیرەتی گۆران. لە رۆژئاوادا ـ عەشیرەتی خەیلانی و خۆشناو.

### رووپێو و ژمارەی ناوچەی سوورچی

دیاریکردنی رووپێوی تریتۆریی عەشیرەتی سوورچی لەبەر نەبوونی سەرچاوەی فەرمی، ئاستەنگە. ئەگەر بێتوو ئێمە رووپێوی ناحیەی هەریر و بجیل بە تریتۆریی عەشیرەتی سوورچی دابنێین، ئەوە رووپێوەکە بە گوێرەی رووپێوی یەکە ئیدارییەکان لە ساڵی ۲۰۰۷دا خۆی لە ۱۳۵۰ کیلۆمەتری چوار گۆشە دەدات.

### ۲. پێکهاتەی قەبیلەیی عەشیرەتی سوورچی

عەشیرەتی سوورچی لە یازدە قەبیلەی گەورە جیاواز بە ژمارە و رووپێوی تریتۆری قەبیلەیی پێکهاتووە. قەبیلەکان بە گوێرەی شوێنی نیشتەجێبوونیان، بۆ سەر دوو ناوچەی جوگرافی ـ قەبیلەیی دابەش کراون.

کۆکردنەوەی زانیاری بە تایبەتی ئەوانەی ناوی توخم و قەبیل و گوند بۆ دیاری دەکات، لەبەر سەربەخۆبوون و دابڕان و قوتکردنەوەی گوند، بە تەواوی ناکرێت. بە گوێرەی ئەنجامی چەند کاری مەیدانی زانیارییەکانی خوارەوەمان، لەسەر قەبیلەکانی نێوچەی بادینان دەست کەوتووە.

یەکەم. قەبیلەکانی سوورچیی نێوچەی بادینان

قەبیلەی سوورچی لە نێوچەی بادینان، واتە دەستە راستی زێی گەورە، لە حەوت قەبیلە، بە ناوەکانی خوارەوە، پێکهاتووە.

### ۱. قەبیلەی ماڵە شێخ

یەک لە قەبیلەکانی سوورچی نێوچەی بادینانە. گەورەکەیان، کچانی شێخ ئەحمەد، ناسراو بە دایک و خویشکە (زەریفەستان و گوڵخاترە) ە. لە چەند بنەماڵان، پێکهاتووە (بنوارە هێڵکاری ژمارە ۱). لە چەندین گوند و شارەدێ و شارۆچکە و شار دەژین. گوندی گەویلان، یەک لە شوێنە نیشتەجێبووە سەرەکییەکانی، قەبیلەی ماڵە شێخە.


هێڵکاری ١
شێخ ئەحمەد کۆلەکی
فەقێ محەمەد
محەمەد سەعید
ئیسماعیل
محەمەد ئەمین
شێخ محەمەدبجیلی
بەشیر
شافی
شەفیع
محەمەد تاهیر
محەمەد سەلیم
محەمەد حافز
(کەزۆ) (کوژرا)
عوبەیدوڵلا
وەجیە
شێخ ئەحمەد (کەکۆ)
شێخ بەدیع
قەیوم
رەقیب
شەفیق
سەدرەدین
مورشید
قوتبەدین
جەلال
شێخ ئەحمەد گچکە
کوڕی نەبووە
(زەریفەستان لە شوێنیتی)

## ٢. قەبیلەی مام گرد

یەک لە قەبیلەکانی سوورچی نێوچەی بادینانە. ردێن سپیەکەیان محەمەدەمین ئەحمەد، دانیشتووی گوندی سوسناوە یە. ئەم قەبیلە لە هەشت توخم، بە ناوەکانی خوارەوە، پێکهاتووە:

١. توخمە شڤان ٢. توخمە حاجی ٣. توخمە بلولۆک ٤. توخمە مالە سێن ,٥ توخمە شکەفتو ٦. توخمە مام رەسی ٧. توخمە سینا ٨. توخمە شێخ زادە

قەبیلەی مام گرد، لە بیست و دوو گوندان، بە ناوەکانی خوارەوە، نیشتەجێن:

١. بیسمەکەرە (موختار ـ سەباح فایق عەبدی)
٢. جۆنەرە (موختار ـ فازل حەکیم محەمەد)
٣. خەلان مام گرد (موختار ـ جاسم تەها ناسراو بە حاکم)
٤. دار زینە ژۆر (موختار ـ سولتان مامەل سمایل و ئەحمەد عەلی وەسمان)
٥. دار زینە ژێر (موختار ـ مام شێخ مستو شەلاق)
٦. داروک (موختار ـ حەمە ئاغای شەفیق عەبدوللا)
٧. داروکە ژێر (موختار ـ محەمەد سەدیق حەسەن)
٨. ستریا (موختار ـ حاجی سالح حاجی)
٩. سیسناوە (موختار ـ محەمەد ئەمین ئەحمەد عەبدی)
١٠. سۆریا (موختار ـ مەحمود خالید مەحمود)
١١. کانی درِی مام گرد (عەلی بەگ مەلا عەولا)
١٢. کەلات (موختار ـ شێخۆ هەمزە محەمەد)
١٣. کەندە سۆر ژۆر (موختار ـ حجی بێ خودان)
١٤. کەندە سۆر ژێر (موختار ـ موسا محەمەد عەلی)
١٥. کێلی (موختار ـ محەمەد حاجی ابراهیم)
١٦. گۆجار (موختار ـ سەدیق محەمەدئەمین حەسەن)
١٧. گەرمکە ژۆر (موختار ـ زرار مەحمود حەسەن)
١٨. گەرمکە ژێر (موختار ـ ئازاد خەلیل تۆفیق)
١٩. مەمەندۆک (موختار ـ عومەر محەمەد خالّ)
٢٠. میربالیا (موختار ـ مەتلەب مینێ)
٢١. هولێ (موختار ـ حەمو حەسەن)
٢٢. هیزا (موختار ـ ئەسعەد حەمەد رەش)

### ٣. قەبیلەی مام ساک

یەک لە قەبیلەکانی ناوچەی بادینانە. ردێن سپیەکەیان بلال مستەفا عەبدوڵا، دانیشتووی شارەدێی بجیلە. ئەم قەبیلە، لە سیانزدە گوندان، بە ناوەکانی خوارەوە، نیشتەجێن:

١. بجیل (موختارەکانی: دلاوەر محەمەد شەریف و شێخ مەزۆ و خال مەلا کەس و عەولا ئەلیاس).
٢. بیێ (موختار ـ حاجی شینو مەحمود)
٣. بێخمە (موختار ـ حەدێ ناخۆش)
٤. بوصێل (ئەحمەد سوورچی)
٥. خانەگە (موختار ـ عەلی رەسول)
٦. زەرگێتە (موختار ـ حاجی خەلیل)
٧. زەنگا (موختار ـ حاجی محەمەد). ئەو گوندە خۆیان بە مام ساکی دانانێن
٨. سەروکانی (موختار ـ بلال عەولاّ رەش)
٩. شەرەفونا (موختار ـ حاجی سلێمان)
١٠. قەصرۆک (موختار ـ خدو حەلیمۆک)
١١. گەروک ژێر (موختار ـ عەولا سمایل)
١٢. گەروک ژۆر (موختار ـ جافر تەها)
١٣. نێروە (موختار ـ رەشۆ عارف)

### ٤. قەبیلەی مام ساڵ

یەک لە قەبیلەکانی ناوچەی بادینانە. ردێن سپیەکەیان عەبدوڵا سەلێم خان دانیشتووی گوندی گەشکانە.

### ٥. قەبیلەی مامکە کۆل (تۆف محەل)

یەک لە قەبیلەکانێ ناوچەی بادینانە. ردێن سپیەکەیان ئەکرەم شێخ حوسێن، دانیشتووی گوندی ......... ئەم قەبیلە لە سێ گوندان بە ناوەکانی خوارەوە، نیشتەجێن:

١. خەلانا ٢. سۆرکان ٣. سەرکەورۆک

### ٦. قەبیلەی چاربۆتی

یەک لە قەبیلەکانی ناوچەی بادینانە. ردێن سپیەکەیان عەبدول کەریم ...... دانیشتووی گوندی کۆلکان کێری یە.

## دووەم. قەبیلەکانی سوورچیی نێوچەی سۆران

قەبیلەی سوورچی لە نێوچەی سۆران، واتە دەستە چەپی زێی گەورە، لە چوار قەبیلە، بە ناوەکانی خوارەوە، پێکهاتووە:

### ١. قەبیلەی ماڵە باس

یەک لە قەبیلەکانی ناوچەی سۆرانە. بریتییە لە سێ تیرە. هەر یەک لەو تیرانە ئاغای خۆی هەیە. ئاغایەکانیش ئەمانەی خوارەوەن:

* عومەر سوورچی (بنوارە هێڵکاری ژمارە ٢). دانیشتووی گوندی کەڵەکینی سەرچیا و هەولێر.
* محەمەد قادر سوورچی (بنوارە هێڵکاری ژمارە ٣). دانیشتووی گوندی باتاس.
* فارس مەلا محەمەد دانیشتووی گوندی بەربیان.
* پاشا عەلی بەگ (پاشا/عەبدوڵا عەلی بەگ/حاجی پاشا) (بنوارە هێڵکاری ژمارە ٤) دانیشتووی گوندی سەرکەور. پێشتر گوندی خرە (ئەمڕۆ خرەی سەروو و خواروو. هەر یەک موختاری خۆی هەیە). گوندی سەرکەور دوای کوشتنی سەدیق، لە سەرچاوە فەرمییەکان و لای هەندێ کەس، کراوە بە سەدیقاوا. وەلێ وەکو لە پرسکردن بۆم دەرکەوتووە ناوی قوتابخانەی سەرکەور سەدیقاوا بووە.

قەبیلەی ماڵە باس، لە هەژدە گوندان لە دەشتی هەریر و سەرچیا، بە ناوەکانی خوارەوە، نیشتەجێن.

ئارمەندان، ئەشکەفتە، برک، بەربیانی سەروو، بەربیانی خواروو، بەردین ، پیرێزە، دێرونە، چەمەسوور، خرە (خرەی سەروو و خواروو)، سەرکەور، فەقیان ، قوبە، قورە بەگ ، قەندیل ، کانی خەزاڵ ، مەرزان ، هەرەش.


هێڵکاری ٢
میرزا ڕەشا شێخ مستەفا
شاری میرزا ڕەشا ئاغا
نەبی شاری میرزا ئاغا
ئەحمەد نەبی شاری سورچی
حەمەد ئەحمەد نەبی سورچی
خدر حەمەد ئەحمەد سورچی
حەمەد ئەحمەد نەبی سورچی
کەریم خان حاوز خدر سەلیم
حوسێن عومەر محەمەد جەمیل ڕەشید سالح
(١٩٩٦ کوژرا) (کوژرا)
نەجمەدین زەید نەجات هونەر ئازاد سەردار سەرتیپ


نەبی
عەبدولا
عەزیز
قادر
مەجید
غەفور
نەبی ئاغا
سەیدە
حامید
ئیبراهیم
محەمەد
عەبدولا
فارس
کازم
جانگیر
پوشۆ
زیاد
معاویە

هێڵكاری ٣



هێڵکاری ٤
ئەحمەد ئاغا
مەحمود پاشا
عەلی بەگ
تەها
حەمەد
عەزیز
حوسێن
عەبدولا
(پاشا)
(حاجی پاشا)
سلێمان
محەمەد ئەمین
کریم خان
عەلی
سەباح
مستەفا
قادر
سامی
فەیسەل
سەدیق

### ٢. قەبیلەی مامە سام

یەک لە قەبیلەکانی ناوچەی سۆرانە. بریتییە لە سێ تیرە. هەر یەک لەو تیرانە ئاغای خۆی هەیە. ئاغایەکانیش ئەمانەی خوارەوەن:

* باویل سادق. دانیشتووی گوندی بەردەگەور.
* عەزیز برایم ئاغا. دانیشتووی گوندی بەردەگەور.

قەبیلەی مامە سام، لە نۆ گوندان، بە ناوەکانی خوارەوە، نیشتەجێن.

ئافریان ، بەرازان ، بەردەگەور ، بەنۆکە ، جۆنەرە ، رکاوە ، فلون، کانی کۆڵک ، گوڵەک ، مەمدی.

### ٣. قەبیلەی وسو کاسکی

یەک لە قەبیلەکانی ناوچەی سۆرانە. بریتییە لە چوار تیرە و هەر یەک لەو تیرانە ئاغای خۆی هەیە. ئاغایەکانیش ئەمانەی خوارەوەن:

* ئەحمەد لاوکە شێخ ئاغا (بنوارە هێڵکاری ژمارە« ٥ » ). دانیشتووی هەریر
* حوسێن کەریم. دانیشتووی خەلیفان.
* خدر حوسێن حارس. دانیشتووی گوندی بیاوێ.
* زرار عەلی بەگ. دانیشتووی گوندی بێکێ.

ئەم چوار ئاغایە، ئەحمەد لاوکە شێخ ئاغایان، وەک نوێنەری خۆیان، هەڵبژاردووە. بە ناوی گشتیان، لەسەر کارێکی زۆر گرنک، بە نموونە، شەڕکردن، مەسڵەتکردن، پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت ... هتد، گفتوگۆ لەگەڵ ئاغای قەبیلەکانی دیکەی سوورچی دەکات.

قەبیلەی وسو کاسکی، لە نۆ گوندان لە دەشتی هەریر و سەرچیا، بە ناوەکانی خوارەوە، نیشتەجێن.

- گوندەکانی دەشتی هەریرێ، ئەوانەن:

ئامۆکان ، شکەوتە، کانی چرگان، ناوشیوان.

- گوندەکانی سەرچیا، ئەوانەن:

جافرەکان، بێکە، رەشەگۆم، زەردەگۆم، ساوان ،قەسرۆک، قەمەریان، مارمن، ماویلیان، هەروێ.


هێڵکاری ٥
حەسەن
سلێمان
شێخ ئاغا
حاجی
عەزیز
مەجید
لاوکە
حاجی چەمۆ
(مەلا محەمەد)
باپیر
حوسێن
سلێمان
ئەحمەد
فەرزەنگ
کەمال
پوشۆ
دلشاد

## ٤. قەبیلەی کڵو (کڕو)

یەک لە قەبیلەکانی ناوچەی سۆرانە. بریتییە لە چوار تیرە. بە ناوەکانی خوارەوە:

١. پیربالّ. لە گوندی زورگێزە و سەرکەند، نیشتەجێیە.

٢. زەنون. لە گوندی مەکردان، نیشتەجێیە.

٣. قۆلار. لە گوندی چەمەکە و سۆکە نیشتەجێیە.

٤. ئاغا. لە گوندی گۆسکە و مەکردان، نیشتەجێیە.

ئاغاکەی محەمەد عەزیز قلیجە (بنوارە هێڵکاری ژمارە«٦»).دانیشتووی هەولێر.

قەبیلەی کڵو، لە یانزدە گوندان لەم بەرەی کەناری زێی گەورە، بە ناوەکانی خوارەوە، نیشتەجێن:

١. باسکە کاریتە (موختار ـ محەمەد عزیز قلیچ)

٢. چەمەکەی خواروو (موختار ـ سالّح عەزیز فەقێ محەمەد)

٣. چەمەکەی سەروو (موختار ـ سوار حەمو وسو)

٤. دڕەمیر (موختار ـ محەمەد مستەفا قادر) (خەڵکی ئەو گوندە شێخ زادەن)

٥. زورگێز (موختار ـ سەلام ئەحمەد خدر)

٦. سەرکەند (موختار ـ عەبدوللا خدر کانەبی)

٧. سۆکە (موختار ـ عەلی پیرۆ)

٨. شیوەدڕ (موختار ـ شهاب حوسێن)

٩. کەلەکێن کڵو (موختار ـ .........)

١٠. گۆسکە (موختار ـ عومەر محەمەد سالّح قلیچ)

١١. مەکردان (موختار ـ فەرهاد هادی)

## سوورچی لە شوێنی دیکە

سوورچی جگە لە ناوچەی بادینان و سۆران، لە دەرەوەی ئەو ناوچانەش هەن. هۆکاری دابڕان و پەیدابوونیان لە دەرەوەی تریتۆری عەشیرەتی، بە گوێرەی ئەوانەی دەشتی قەراج و کەندێناوە، وەکو لە ئەنجامی سەردانی مەیدانی پێنج شەممە ١٩ شوباتی ٢٠٠٩) بۆ شارەدێی باقرت ـ مەرکەزی ناحیەی قەراج ـ بۆم ئاشکرابوو،


هێڵکاری ٦
عەزیز قلیج عەزیز
قلیج
عەزیز
سالح
مەحمود
مەجید
محەمەد
حەمەدەمین
ئەحمەد
خەسرۆ
عومەر
شەهاب
حەمەدەمین
حوسێن
عوسمان
مەحمود
مەجید
قلیج

بەو شێوە بووە. بنەماڵەیێکی ماڵە باس دانیشتووی گوندی خڕێ و ڕەشا لەگەڵ بنەماڵەیێکی دیکە، لەسەر زەوی یان شتێکی دیکە، دەبێ بە شەڕیان. بنەماڵەی یەکەم سێ پیاوان لە بنەماڵەی دووەم دەکوژن. پاشان، لەبەر ئەوەی کێشەکەیان بۆ چارەسەر ناکرێت، ناچار دەبن ناوچەکە جێ بهێڵن و لە شوێنی دیکە نیشتەجێ بن.

عەبدولایان ڕوو لە دەشتی مرکیە دەکات و لە گوندی باقرتە نیشتەجێ دەبێ. حەمەدیان جوانەمەرگ دەبێ. وەیسییان (نەوەکانی کە لە ٥٠٠ خێزان تێدەپەڕێ لە حی الاکراد لە قامشلی دەژین) بۆ شام دەچێ. عەبدولا دواتر بۆ گوندی سێچارە و گوندی شۆڕە زەرتکە بار دەکات. وەلێ لەگەڵ قادر ئاغا هەڵناکات و جارێکی دیکە بار دەکاتەوە ئەو جارەیان بۆ گوندی سیرمە و دواتر بۆ گوندی زوڕنا لە دەشتی قەراج. ئەوە لە کاتێک بووە کە هێشتا زەوی و زاری دەشتی قەراج، بە دەستی لایەر ـ زەوی پێوەر (مساح) ی ئینگلیزی ـ لەسەر خەڵک و ئەوانەی بۆ ئەو ناوچە کۆچیان کردبوو، تاپۆ نەکرابوو. ساڵێک لە ساڵەکانی پەنجای سەدەی بیست، کلۆیێکی زۆر دەگاتە دەشتی قەراج و دواتر دەشتی کەندێناوە، زیانێکی گەورە بە دەغڵ و دانی ناوچەکە دەگەینی و بیرەکانیش لە کلۆ پڕ دەبن. خەڵکی گوندی زوڕنا، لەبەر برسێتی و بێ ئاوی بۆ لای گوێڕ بار دەکەن. زوڕناییەکان، دوای تێپەڕبوونی کلۆ، دێنەوە سەر گوند و حەمەدەمین شێتە بیرەکەی دەردەداتەوە، وەلێ لەبەر برکی بیرەکە، دواتر گیان لەدەست دەدات.

حاجی جەلعاو، گوندەکەی بە دە دینار دەفرۆشی. فەقێ سعید حسین، دوای هاتنی خەبەری فرۆشتن، لە گوێڕ بۆ زوڕنا، دەگەڕێتەوە و پارەکەی بۆ کڕیار دەگێڕیتەوە. لەو ڕۆژەوە تاکو ئەمڕۆ نەوەکانی خەلیفە عەبدولا، بە نموونە، محسن ملا سعید و هیدیکە، لەو گوندە نیشتەجێن.

سوورچییەکان، ئەمڕۆ، لە گوندەکانی دەشتی قەراج وەکو زوڕنا (٣٥ خێزان) و خەزنە و سیرمە و قەسرانی مەخموری و شارۆچکەی مەخمور (٢٠٠ خێزان) و شارەدێی باقرت و دەشتی کەندێناوە وەکو بیرەبەرازە و تەلەل خێم و قەپران و دەشتی مرکیە وەکو باغەمرە ڕەقە (باغەمرەی شەهابی)و باغەمرەی ئەفەندی و شوێنی دیکە.سوورچییەکانی دەشتی قەراجی، پەیوەندییان لەگەڵ سوورچییەکانی دیکە نەپچڕاوە. ئەوان تێکەڵاوییان لە گەڵ نەوەکانی شێخ بەدیع و ماڵی پاشا و هیدیکە گەرمە. ئەمان سەردانی ئەوان دەکەن و ئەوان سەردانی ئەمان دەکەن. فەرمانی دایک و خوشک ڕەت ناکەنەوە و بە هاواری سوورچییەکانی دیکە دەچن.

## ٣. بنەمای ئاینی و دنیایی
## لە ناو عەشیرەتی سوورچی

عەشیرەتی سوورچی لە رووی بنەمای ئاینی و دنیاییدا، وەکو عەشیرەتی بارزانی و بەرزەنجی، لە دوو دەستە پێکهاتووە. لە خوارەوە بە گوێرەی ئەو مەتریالانەی دەستم کەوتوون، باسیان دەکەم.

### یەکەم. بنەمای ئاینی

#### ١. شێخ

شێخەکان، بە گوێرەی گوتەی خۆیان، نەوەی دووەم خەلیفەی ئیسلام، واتە عومەری کوری خەتاب ن. هەر لەبەر ئەمەشە خۆیان بە عومەری ناودەبەن. کەوابێ شێخەکان لە بنەچەوە عارەب بووینە و لە کوردستان جێگیر بووینە، لەبەر ئەوەی خەڵکی ئێمە ئەوانەیان زۆر پێ پیرۆز و گەورە بووە، بۆ کاروباری ئاینی پرسیان پێ کردوون و بۆ چارەسەری گرفتی کۆمەڵایەتی روویان تێ کردوون، بەو شێوە خەڵکیان لە دەور کۆبووتەوە و دەسەڵاتیان پەیدا کردووە و زەوی و ماڵاتیان دەست کەوتووە.

دەسەڵاتی ئاینی لە ناو عەشیرەتی سوورچی بە شێخ ئەحمەد کۆلەکی دەست پێ دەکات. ئەو شێخە یەکەم تەکیەی نەقشبەندی لە بادینان و لەسەر دەمی میر ئیسماعیل ئاکرەیی لە گوندی کۆلەکا دروست کردووە. تەریقەتی ناوبراو لەو ساوە تاکو ئەمرۆ، مریدی خۆی هەبووە و هەیە و رۆڵی گرنگ لە ژیانی ئاینی و دنیایی گێڕاوە و دەگێڕێت. شێخە بەناوبانگەکانی، ئەوانەی تەریقەتیان داوە و مریدیان لەدەور کۆبوونەتەوە، ئەوانەی خوارەوەن:

#### شێخ ئەحمەد کۆلەکی (... ـ ١٨٥٣ زاینی)

ئەحمەد عەبدوللا عەبدال حاجی هەمزە عومەر عەبدوللا عاسم عومەر محەمەد ئەحمەد عەبدوللا عەلی ئەحمەد محەمەد عەبدوللا عومەر (مەبەست خەلیفە عومەرە). لە ناوچەی سوورچییاتی لەدایک بووە و تەریقەتی لە سلێمانی لای مەولانا خالد نەقشبەندی وەرگرتووە و لە بادینان، بە تایبەتی لە ناو عەشیرەتی سوورچی، دەستی بە ئیرشاد کردووە. مریدی لە ناوچەکانی دەشتی هەریر و رواندز و لاجان هەبووە. خەلیفەی بۆ چەند ناوچەیێک دیاری کردووە، بە نموونە، خەلیفە تەها (گوندی جونا) و خەلیفە سۆفی خدر (گوندی دۆڵەتسیوێ)

### شێخ محەمەد ئەحمەد کۆلەکی (.... ـ ١٩٠٦ زاینی)

لە گوندی کۆلەکا لە دایک بووە. لای مەلایەکانی تەکیەی باوکی خوێندوویەتی. لەسەر دەمی باوکی کراوە بە خەلیفە وسەربەخۆ تەریقەتی داوە. تەکیەی لە کۆلکا بۆ بجیل گواستووتەوە. مریدی لە دەشتی هەریر و رواندز و ناوکورِ و لاجان هەبووە. یەک لە خەلیفە ناودارەکانی بە ناوی محەمەد ئەمین کانی وەتمانی بووە. ژمارەیەک مەلا، لە نێوانیاندا مەلا محەمەد ئیمام ، قوتابییان لە قوتابخانەی بجیل فێری زانستی ئاینی کردووە. یەک لە قوتابییەکانی ئەو قوتابخانە مەلا ئەحمەد (سالّی ١٩٤١ زاینی مردووە) مەلا محەمەد بووە. مەلا ئەحمەد ئیمام و مودەرِسی مزگەوتی گەورەی ئاکرێ بووە. شێخ محەمەد لە گۆرِستانی بجیل لە مەزاری سپی نێژراوە.

### شێخ بەدیع (... ـ ١٩٥٤ زاینی)

شێخ بەدیع لە دوای مردنی شێخ محەمەدی باوکی کاروباری ئاینی عەشیرەتی سوورچی لە ئەستۆ گرتووە. خانەقای لە گوندی بجیل بۆ گوندی دۆبێ گواستوەتەوە.

لە سەردەمی شێخ بەدیع هۆزەکانی خەیلانی و بالّەکی و رەڤەندۆک وەک مریدی شێخەکانی کۆلکا خۆیان ناساندووە. لە مەزاری سپی لە بجیل بە خاک سپێردراوە.

### شێخ ئەحمەد گچکە (١٩٢١ ـ ١٥/ ١٠/ ١٩٧١)

شێخ ئەحمەد کورِی شێخ بەدیع ناسراو بە گچکە، دوای مردنی باوکی لە تەمەنی چواردە سالاّندا، لە شوێنی باوکی دانیشتووە. کاروباری ئاینی بەرِێوە بردووە. خانەقای لە گوندی دۆبێ بۆ گوندی گەویلان گواستەوە. لە مەزاری سپی لە بجیل لە تەنیشت باوکی بە خاک سپێردراوە.

شێخ ئەحمەدی گچکە دوو ژنی، بە ناوەکانی خوارەوە، هەبووە.

یەکەمیان. بەس (کچی کەریم خانی خەیلانی) ( لە ٢٥/ ١٠/ ٢٠٠١ مردووە).
لەم ژنەی دوو کچی، بە ناوەکانی خوارەوە، هەبووە:

گولّخاتر

زەریفەستان

دووەمیان. مەرەز (کچی قلیچ عەزیر کرِو) (لە ١١/ ١٠/ ٢٠٠٦ مردووە). لەم ژنەی دوو کچی، بە ناوەکانی خوارەوە، هەبووە:

خەدیجە (لە ٢٠٠١/١٠/٢٦ مردووە)
ئەسم (لە ٢٠٠٤/١١/١٧ مردووە)
سوورچییەکان بەقەدەر شێخ ئەحمەد ڕێز لە ژن و کچەکانی دەنێن و لە جیاتی ناوی ڕەوانی خۆیان بە داک و خۆیشک (مەبەست هەردوو ژن و کچەکانە) ناویان دەبەن و لەگەڵیان دەدوێن. لە خوارەوە باسی کچێکی، لەبەر ئەوەی لە شوێنی باوکیتی، دەکەم.

## زەریفەستان

کچی گەورەی شێخ ئەحمەدی گچکەیە. لە شوێنی باوکی لەبەر ئەوەی برای نە لە دایکی خۆی و نە زردایکی نەبووە، سەرپەرستی کاری ئاینی و دونیەوی سوورچیانی بادینان و شوێنی دیکە دەکات.
زەریفەستان کچێکی پڕە و بالاکەی نزیکەی ١٧٥ سم دەبێ. ڕەنگ مەیلەو ئەسمەرە. وەلێ خوێن شیرین و دەموچاو خڕە و لووتی کەمێک قولابییە. پۆشاکی ڕەش و زۆر سادەی دەپۆشی و دەستماڵ لە سەر وەلێ وەکو هەر کچێکی دیکەی کورد بەستاوێتی.
مەیلی ئاینی زۆرە وەلێ لە جل و بەرگ و قسەکردن و هەڵسوکەوت، توندڕەو دیار نییە. تاکو ئێستاکە حەوت حەجی کردووە و هەر جارەش ئەو سەفەرەی کردبێتی بیست ژن و پیاوی لەگەڵ خۆی بردووە و خەرجی هەمووشیانیشی کردووە. سێزدە مزگەوتی لە شوێنی جوداجودا دروست کردووە. بە نموونە، مزگەوتەکانی گەڕەکی دۆمیس (ڕووپێو ـ ٣٥٠٠ م٢) و گەڕەکی ئارپێچیە (ڕووپێو ـ ٤٥٠٠ م٢) لە شاری موسڵ و هی گەویلان و چەمەسێل و سەرکەنداڵ و مەمەندۆک و نێروە و بێێ و گەڕەکی قاچاغاوا لە شارۆچکەی ئاکرێ و شوێنی دیکە.
خوشک سەرپەرشتی مریدەکانی سوورچی و ڕەوەندۆک و باڵەکی دەکات. بڕیارەکانی لای گشت عەشیرەتەکانی دیکەی سوورچییان ڕەت ناکرێتەوە و ئەوەی بیڵێ جێبەجێ دەکرێت. ڕێزی تایبەتی لە دەرەوەی عەشیرەتی سوورچی هەیە. بە نموونە، ئەو کاتەی لە حەج بوو داوەتی ماڵی مەلیکی عارەبستانی سعودی کراوە. سیاسەتمەدارانی کورد وەکو مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی و کۆسرەت ڕەسوڵ و هیدیکە بە مەبەستی جودا سەردانیان کردووە.
زەریفەستان کە جاری دووەم سەردانی گەویلانم کرد، لەبەر ئەوەی بۆ

چارەسەکردنی نەخۆشیی بۆ ئوردن چووبوو لە ماڵ نەبوو. سوورچییەکان بە گشتی و مریدەکان بە تایبەتی لە دووری غەمبار بوون و سەردان و زکرەکانیان ساردی پێوە دیار بوو

**پایەکانی تەریقەت**

پایەکانی تەریقەت لە ناو سوورچییەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم. شێخ**

یەکەم پایەیی تەریقەتە، وەک ئەوەی لە ناو عەشیرەتەکانی دیکەی باشووری کوردستان، ئەوهاش لە ناو سوورچییەکاندا. شێخایەتی پشتاوپشتە. واتە لە باوکەوە بۆ کوڕ دەمینێتەوە. وەلێ گەر شێخ کوڕی نەبووبێ یان نەمابێ کچی گەورە بۆی هەیە، سەرپەرشتی ئەو پۆستە ئاینییە بکات. شێخایەتی لە رۆژی ئەمرۆکە لەبەر ئەوەی شێخ ئەحمەد کوڕی نەبوو، زەریفەستانی کچی گەورەی سەرپەرشتی تەریقەت دەکات.

**دووەم. خەلیفە**

دووەم پایەیی تەریقەتە. خەلیفە کەسانێکە بە دڵسۆزی بۆ ئاین ناسراو بێت و جێگەی متمانەی شێخ بێت. خەلیفایەتی پایەیەکی پشتاوپشت نییە و لە لایەن شێخەوە بۆ شوێنێک دیاری دەکرێت. ئیش و کاری خەلیفە خۆی لە هەڵسووراندنی کاروباری ئاینی و هەندێ جار دونیەوی، لە جیاتی شێخ لە شوێنێک، دەبینیتەوە.

**سێیەم. موخلس و مومکر**

کۆمەڵگەی سوورچی، لە رووی پشتگیری کردن و ملکەچییان بۆ شێخ، دەکرێن بە دوو دەستە بە ناوەکانی خوارەوە:

**موخلیس**

مەبەست لەو پایەیی تەریقەتە ئەو کەسەیە کە شێخ متمانەی تەواوی پێ داوە. هەر بۆیەش شوێنێکی تایبەتی لە ناو مریدەکاندا هەیە. موخلس کە لەسەر دەستی باوباپیرانی داک و خوشک تۆبەیان کردووە، بۆی هەیە سەرپەرشتی مریدەکان لە رووی ئاینییەوە بکات. موخلیسایەتی پایەیێکی ئاینی ئازادە هەر کەسێ ئارەزووی

هەبێت بۆی هەیە خۆی بە موخلیس بناسێنێت. موخلیس بەو نیشانانەی خوارەوە لە مومکران جودا دەکرێنەوە:
١. سەری کۆت ناکات
٢. شال و شەپک لەبەر دەکات
٣. گۆپالێکی باریکی بە قەدەر بالاّی خۆی بە دەستەوەیە. وەلێ بۆ رۆیشتن نییە.
٤. زۆربەیان دوو جەمەدانی رەش دەبەستن
٥. لچکی جەمەدانییەکانیان لە پشتەوە بە چەپ و راست داوێنە سەر یەکتر.
موخلیس بڕوای رەهای بە شێخ و بنەماڵەی شێخی هەیە. بە هیچ شێوەیێک سەرپێچی لە فەرمانەکانیان ناکات. ئەوەی پێی بگوترێ بێ یەک و دوو جێبەجێیان دەکات.

### مومکیر

مومکیر لە وشەی مونکری عارەبی وەرگیراوە. واتە ئەو کەسانەی بڕوایان بە شێخ و بنەماڵەی شێخ نییە. مومکیرەکان پێیان وایە، ئەوەی شێخەکان دەیکەن، رێگایێکە بۆ چەوساندنەوەی خەڵک و کۆکردنەوەی سامان و بەرزکردنی پایەیی کۆمەلاّیەتییان لە ناو خەڵکی هەژار و نەخوێندەوار و هیدیکە.

### ٢. شێخ زادە

ئەمانە لە بنەماڵەی شێخ ئەحمەد کۆلکی نینە و خۆیان بە عومەری دانانێن. وەلێ خۆیان بە سوورچی دەزانن. شێخ زادەکان لە ناوچەی سۆران لە گوندەکانی: دۆڵەتێسو و قەندیل و سیناوە و هەنارەی بیاوی ژووری و ژێری نیشتەجێن. لە ناوچەی بادینان لە گوندەکانی: خەرا و زێوە دەژین. جگە لەو شوێنانە، چەند خێزانی شێخ زادە لە خەلیفان و لە هەریر و شوێنی دیکە هەن.

### شێخ زادەکانی دۆڵەتێسوی

گوندی دۆڵەتێسوێ، مۆڵگەی سەرەکی شێخ زادەکانی ناوچەی سۆرانە. ئەمڕۆ نزیکەی ٢١ خێزان لەو گوندە نیشتەجێن. ئەو گوندە کەوتووتە سەر زێی بادینان (زابی گەورە) لە گەلی بێخمە، نێوانی لەگەڵ تونێلی ئاوبەندی بێخمە بە رۆیشتن هەر چارێگە سەعاتێک دەبێ.

سەربردەی شێخ زادەکانی گوندی دۆڵەتێسوێ، وەکو گوێ بیستیان کردووم، دەبێ لە پیاوێکی ئەو گوندە کە دواتر بە سۆفی خدری سەرگەلی لای خەڵک ناسراوە، دەستی پێکردووە (بنوارە هێڵکاری ژمارە«٧»).

سۆفی خدر لە تەمەنی لاوێتیدا، ئەو دەمانەی لە چیابووە، ئارەزووی لێدانی شمشاری، بۆ گەنجان، کردووە. رۆژێک دەچێتە سەر دارێک و دارەکە دەشکێ، وەلێ ئەو لەسەر لکە دارێک بە ئاسمانەوە دەمینێتەوە و ناکەویتە سەر عەردی. کە خۆی وا دەبینی یەکسەر دەچێتە گوندی دۆبێ نزیک گوندی گەویلان و لەسەر دەستی شێخ بەدیع تۆبەی نەسوح دەکات و بۆ دۆڵەتێسوێ دەگەڕێتەوە.

شێخ زادەکان و خەڵکی ناوچەکە، بۆ پیرۆزکردن و رێزگرتن و بەرزکردنی پایەیی ئاینی، رووداوی سەیروسەمەرەی، وەکو ئەمانەی خوارەوە، لە سۆفی خدر، دەگێڕنەوە.

* بە گوێرەی گوتەکانی شێخ زادەیەک، نوێژی هەینیانی لە سعودیە، دەبێ لە مەکە بووبێ، کردووە. بۆ ژەمی نیمەڕۆش بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە.
* پیاوییێکی ئاکرێیی لە کاروانی حاجییان بەجێ دەمینێ. ئەو پیاوە لە رێگەی خەڵکەوە ناوبانگی سۆفی خدر دەزانی. پێی دەڵێن، دەبی پێش سەلامدانەوە بە راست و چەپ، لەبەر ئەوەی دوای تەواو بوونی نوێژ گیر نابێ، بگەیتە لای.



کابرا وا دەکات و داوای لێ دەکات لەگەڵ خۆی بۆ ئاکرێ بیباتەوە. سۆفی خدریش، دوای پاڕانەوەی کابرا، هەندێک دەڵێن لەسەر پێی خۆی دایناوە و هەندێک دەڵێن دوعای بۆ کردووە، کە چاوی دەکاتەوە خۆی لە ئاکرێ دەبینێتەوە. سۆفی خدر بە کابرا دەڵێ لە بازاڕی ئاکرێ، ئەفسەرێکی کڵاو سوور لەسەر دێ و دەچی کە تووشی هاتی زللەکی لە بنا گوێی بدە. کابرا تووشی ئەفسەرەکە دێ و زللەکی لێ دەدات. ئەویش دەڵێ خوات بە قوربانی سۆفی خدر بکات دەنا دەمزانی چۆنت تەمبێ بکەم. کابرای ئاکرێیی کە تەماشا دەکات دەبینی سۆفی خدر لە ناو شایی رەشبەڵەکدایە. زۆری پێ سەیر دەبێ و لێی دەپرسی چۆن چوویتە ناو شایی رەشبەڵەک ئەویش دەڵێ گەر نەمکردایە ئەسووتای.

* سۆفی خدر کە بۆ چیا دەچوو خوێی لەگەڵ خۆی بردووە. حەیوانی کێوی پێ خوێداوە. پیرێژنێکی گوندی داوای لێ دەکات حەیوانێکی خراپی، بۆ ئەوەی پیستەکەی بکات بە شتێک، بۆ سەر ببڕێ. ڕۆژی دواتر، ساتۆر لەگەڵ خۆی هەڵدەگری، هەموو حەیوانەکان، جگە لە بزنە شەل، بۆ خوێ خواردن وەکو جاران بۆ لای سۆفی خدر دێن. کە دەبینی بزنە شەل نەهاتووە تێدەگات. هەنگێن بۆ خوێ خواردن بانگی دەکات. گفتیشی پێ دەدات کە سەری نەبڕێ.
* ئەندازیارێکی ئینگلیزی، لە نزیک گوندی دۆرەتێسوێ، خەریکی کاری ئەندازیاری ئاوبەندی بێخمە دەبێ. پێیان گوتووە کارەکە، لە بەر ئەوەی گۆڕی شێخەکان دەکەونە ژێر ئاو، سەر ناگرێ. گوتوویەتی (من دەیکەم با شێخەکان رایگرن) لە کاتی پەڕینەوەی بە داڤەڕست لەم بەر بۆ ئەو بەری زێ، داوەکە دەسووتێ و ئەندازیارەکە و ئەو دوو کەسی لەگەڵی دابووینە دەکەونە ناو ئاو و سکەت (سکەت وشەیێکە لە جیاتی مردن، بۆ کەسانی غەیرە دین، لەو ناوە بەکار دەهێندرێ) دەبن.
* خێزانی سۆفی خدر چێشت لێ دەنێ و دەڵێ خۆزیا خدریش لەو چێشتەی دەخوارد.رەنجبەرەکەیان دەڵێ تێکە من بۆی دەبەم. کە چێشتەکەی لە پێش دادەنێ، هێشتا هەڵمی لێ هەڵساوە. کە دەگەڕێتەوەماڵێ دەڵێ "بەخوا خواردنێکی خۆش بوو".

گۆڕی سۆفی خدر، لەسەر وەسیەتی خۆی، لە بەری دەستەچەپی زێی بادینان لە گۆڕستانی گوندی دۆڵەتێسوێ و بەرامبەر گۆڕی مەلا سمایل لەو بەری زێی بادینان لە گۆڕستانی گوندی مالاموس، نێژراوە.

گوندی دۆڵەتێسوێ، گەر ئاوبەندی بێخمە سەربگرێ (خەڵک پێیان وایە سەری نەگـرتووە و سـەریش ناگـرێ) بەر لەهەر شـوێنێک، ئاو دایدەگـرێ. کـەوابێ گـواسـتنەوەی گـۆڕی شـێخ زادەکـان، بە تایبـەتی گـۆڕی سـۆفی خـدر، بۆ شـوێنێکی دیکە، ئەو خەمە بوو کە حکومەت مشوری بۆ دەخوارد. بڕیاردرا گۆڕەکان بۆ گوندی بەردین بگوازرێنەوە. بۆ ئەو مەبەستە دایک و خوشک و خەڵکی دەڤەرەکە لەسەر گۆڕستانەکەی ژێر دار بەڕووە مەزنەکە، بە سندوق و کیسەی سپی، کۆبوونەوە. سێ کـەس بە ناوی مـەلا حـەولای ئامـۆکـان و حـەمـە حـەولای بەردینی و مـەلا ناوێک دەسـتنیـشـان کـران، بە مـەرجـێک ئەوەی دەیبـیـنن نابێ بۆ کـەسی بگـێـڕنەوە، دوای هەڵکـۆڵـینی گـۆڕەکـان، هێـسک و پروسکەکـان لە کـیـسـەکـان بکەن. پاشـان لە گـۆڕسـتـانی بەردینی جـارێکی دیکە شـاردراونەتەوە. ئەگـەر چی گـۆڕەکـان گـواسـتـراونەتەوە وەلێ خەڵک پێیان وایە، لەبەر ئەوەی سۆفی خدریان لە خەون لە شوێنی خۆی بینیوە، شێخ زادەکان هەر لە شوێنی خۆیان ماونەتەوە.

هەڵدانەوەی گـۆڕەکـان، لەبەر ئەوەی شـێخ زادەکـان لای خـەڵک زۆر جـێگەی متمانەی خەڵکن، کارێکی هەر وا ئاسان نەبووە و نییە. دەگێڕنەوە چەند بلدۆزەر کە شوفێرەکانیان لە تورکیاوە هاتبوون، لە سەر گۆڕەکان چەقیون و دەمەکانیان خوار بووتەوە و شوفێرەکانیان ملیان بەلایێکەوە شۆڕ بووتەوە. یەکەکیان دوو جوانەگای کردووتە خێر بۆ ئەوەی ملی وەکو خۆی لێ بێتەوە و گفتی داوە بگەڕێتەوە تورکیا و جارێکی دیکە بۆ کار روو لەو ناوە نەکاتەوە.

### شێخ زادەکانی گوندی قەندیل

گـوندی قـەندیل، کـە کـەوتووتە سـەر زێی بـادینان (زێی گـەورە)، یەک خـێـزانی شێخ زادە، بە ناوی شێخ سەلام ( لە مانگی رەمەزانی ساڵی **١٩٩٣** مردووە)، لێ نیشتەجێیە. ئەو شێخە باوکی سێ کوڕانە بە ناوی محیەدین (ناسراو بە بابۆک) و عەلائەدین و عەبدولرەحمان. یەکەمیان، لەبەر ئەوەی جێگری باوکێتی لە کاروباری ئاینی و برا گەورەیانە، لە وانتر لەبەرچاو و بەناوبانگترە. ئەوەیان وەکو خۆی بۆی باسکردم، دەستی چاکردنەوەی نەخۆشانی، بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیێک لە نەخۆش و لە شوێنی جیاجیاکانی کوردستانی هەیە. بە نموونە، شێرپەنجەی بەو شێوە چاک دەکاتەوە. نەخۆش کە بۆ لای هات یەکسەر پارێزی لە خواردنی ساوار و گۆشت و ترشی، بۆ چل رۆژان، پێ دەکات. بەمەبەستی دوعا و شیفا، دەیباتە زیارەتی گۆڕی

باوکی. هەندێک خۆڵی سەر گۆڕەکە لەگەڵ خۆیان دەیننەوە ئینجا دەیکەن بە قوڕ و لە شوێنی برینەکەی دەدەن. دەبێ حەیوانێک سەرببڕێ و گۆشتەکەی بەسەر دەستکورت و هەژاری گوند، ببەشێتەوە. (چارەسەرکردنی شێرپەنجە بەو شێوە زانست نەیسەلماندووە).

شێخ زادەکان، لە جیاتی چاککردنەوەی نەخۆشان و دوعا، روو بەڕوو داوای پاداشت ناکەن. وەلێ ئەگەر کەسێک بیەوێ شتێک بە شێخ زادە ببەخشێت ئەوە دەستی کەرەم ناگێڕدرێتەوە.

بەر لە دامەزراندنی مەلا مەجید لە لایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی بۆ مزگەوتی قەندیل، شێخ محیەدین پێش نوێژەکانی دەکرد و گوتاری هەینیشی بۆ نوێژکەران دەخوێندەوە. لە شوێنی ئەم کارانەی لە سەرەتاوە ٢٥٠ هەزار و دواتر زیادی کرد بۆ ٤٥٨ هەزار دیناری، لە وەزارەت، وەردەگرت.

**٣. مەلا**

مەلا کەسانێکە زانستی ئاینی لای مەلاییێکی دوانزدە علم، لە شوێنێکی ئاینی وەکو مزگەوت و خانەقا و قوتابخانەی ئاینی و کۆلێژی ئاینی خوێندووە و ئیجازەی مەلایەتی پێ دراوە. مەلا، لە لایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی بۆ مزگەوتی ناو شارەکان و گوندەکان، دیاری دەکرێت. هەندی جار خەڵکی گوند مەلای بۆخۆیان دیاری دەکەن و خەرجی دەدەن. ئەمڕۆ زۆربەی هەرە زۆری گوندەکانی سوورچییان بێ مەلا و مزگەوت نین.

کاری مەلا لەو مزگەوتانە خۆی لە پێش نوێژ و خوێندنەوەی گوتاری هەینی و مارەبڕین و تەڵاقدان و نوێژکردن لەسەر مردوو و لە بن گوێ خوێندن (تەلقین) ی لە گۆڕنراو و ناوبژی کردنی هەندێ گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و فێرکردنی قورئان و کاری دیکە، دەبینیتەوە.

## سوورچی کریستیان

هەبوونی سوورچی کریستیان بۆ من و خەڵکی دیکە لەبەر ئەوەی سەرتاپایان وەکو دەزانین ئیسلامن شتێکی سەیر بوو. وەلێ دوای لێکۆڵینەوە و پرسیارکردن دەرکەوت کریستیانەکانیان بە بنەچە سوورچی نین. بەڵکو دانیشتوانی گوندەکانی نەهاوا و خەرجاوا ناحیەی گردەسێن هەر لە بنەڕەتەوە کریستیان بووینە و لە ترسی

گرفتی دراوسێ موسڵمانەکانیان و پاراستنی ئاینەکەیان خۆیان بە سوورچی کریستیان لە قەڵەم داوە.

**٢. دووەم. بنەمای دنیایی**

سوورچییەکان لە روانگەی پایەیی کۆمەڵایەتییان لە ناو خۆیاندا لە یەک ئاستدا نین. جیاوازییەکەش بۆ مێژووی گەشەکردنی عەشیرەتەکە دەگەرێتەوە. پایە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرێکەوە لەبەر ئەوەی پشتاوپشتن لەسەرێکی دیکەوە، لەبەر ئەوەی دەسەڵات پشتگیری لە مانەوەیان دەکات، ئاڵوگۆریان بەسەردا نایێت. پایە کۆمەڵایەتییەکان لە ناو عەشیرەتی سوورچیدا ئەمانەن:

**١. ئاغا و ئاغایەتی**

بەرزترین پایەیی کۆمەڵایەتییە، لە ناو عەشیرەتی سوورچیدا. هەر قەبیلە و هەر تیرە ئاغای خۆی هەیە. وەلێ لە رووی دەسەڵاتەوە، وەکو یەک نین. پوولدارەکانیان و خاوەن زەوی و زارە زۆرەکانیان و متمانەدارەکانی حکومەت و هی حزبەکان، لەوانەی ئەو سفەتانەیان نییە، لە ناو سوورچییەکاندا، بە دەسەڵاتترن.

پایەیی ئاغاکان لەناو سوورچییان، لە ژێر بارودۆخی سیاسی ئەمرۆکەی باشووری کوردستان، لە هەڵبەزین و دابەزین دایە. هەندێک ئاغا، بە بەسەرچوونی بارێکی سیاسی و هاتنی بارێکی دیکەی سیاسی، هێز و ناودارێتی خۆی لەدەست دەدات و لە شوێنی ئەو ئاغاییێکی بێ هێز و نەناودار شوێنەکەی دەگرێتەوە. بە نموونە لە سەرەتای داگیرکردنی باشووری کوردستان لە لایەن ئینگلیزەوە، بە گوێرەی گوتنی هەندێ کەس، ماڵی تاژدین (بنوارە هێڵکاری ژمارە«٨») و ئەحمەد ئاغا (بنوارە هێڵکاری ژمارە«٤»)، ئاغای بە دەسەڵات بووینە. وەلێ ئەمرۆ دەسەڵاتی ئەوکاتیان نەماوە و لە خەڵکی ئاسایی دەچن و بروایان بە ئاغایەتی، وەکو دەسەڵات، نەماوە. لە شوێنی ئەمانە، محەمەد قادر و عومەر سوورچی، بە تایبەتی دوای بوونی، یەکەمیان، بە خاوەن فەوجێکی پاڵپشت بۆ عێراق، بەر لە ساڵی ١٩٩١، بوون بە ئاغای بەرچاوی سوورچییان. ئەمانەش لە رۆژی ئەمرۆدا، جگە لە هەندێ دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتی سیاسییان، نەماوە.

هەندێک لە ئاغاکان، بە تایبەتی ئەوانەی کەمتر ناسراون و سەنگی سیاسییان کەمترە لە هی دیکە، لەبەر ئەوەی وەکو پێویست گوێرایەڵی ئامۆژگارییەکانی پارتی


هێڵکاری ٨
ئاژدین (تاجەدین)
حەمەد ئاغا
سابق
سەلیم ئاغا
عومەر
شێ محەمەد
عارف
جەبار
خورشید
باویل ئاغا
تاژدین
عەلی
فارس
سەباح
سەلیم
قادر
کەریم خان
سالح
ئەسعەد
شێ محەمەد
عارف
جەبار
خورشید
رەسول ئاغا
قادر
تەها
ئەحمەد
محەمەد
زیاد
یوشۆ
دینۆ
ئەحمەد
سەعید
نیتی




دیموکراتی کوردستان نینە، بە نموونە، محەمەد عەزیز قلیج ئاغای قەبیلەی کلۆ، خۆیان بۆ لە گوندەکانیان ناگیرێت و بە ناچاری بۆ شارەکان کۆچ دەکەن.کاری ئاغا، لە سەردەمی ئێستادا، خۆی لە هاوبەشیکردن لە چارەسەرکردنی هەندێک لە گرفتەکانی کۆمەڵایەتی، بە نموونە، مەسڵەتکردن و پێکهینانی دوو لایەنی گرفتدار لەسەر زەوی و ئاو و ناخۆشی لەسەر منداڵان و پەیوەندی نە ئاسایی کوڕێک و کچێک یان پیاوێک و ژنێک، دەبینیتەوە.ئاغایەتی، لەبەر باڵادەستی دەزگایەکانی دەوڵەت وەکو پۆلیس و دادگا و تاپۆ و فەرمانگەی ناونووسین و قوتابخانە، هەروەها باڵادەستی حزب و رێکخراوە جەماوەرییەکان، خەڵک پێویستییان پێ نەماوە و پێویستیش نییە. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ شوێناندا، بە تایبەتی ئەوانەی لاپەڕ هەڵکەوتوون، رۆڵی خۆی لە ژیانی خەڵک دەبینی.

ئاغاکان، ئەگەرچی بۆ گفتوگۆکردن، لەسەر کێشەیێکی گرنگی وەکو شەڕیان لەگەڵ عەشیرەتێکی دیکە یان هەڵوێستیان بەرامبەر داواکارییەکانی حکومەت، زۆربەیان لە ماڵی یەک لە ئاغاکان کۆدەبنەوە، وەلێ لەناو خۆیاندا، تەبا نین و هەندێ جار تووشی خوێن ڕشتنی یەکتر دەبن. بە نموونە، بنەماڵەی محەمەد قادر و باویل سادق. ڕووداوەکە، وەکو لە گوندی فلون بۆیان گێڕاومەتەوە، بە کورتی ئەوها قەوماوە. سادق لەگەڵ یەک دوو کەسی دیکە، لە ساڵی ۱۹٦۳دا، لە لایەن سێ پیاوی محەمەد قادر، لە باتاسی، داوای چەک دانانیان لێ دەکرێ. ئەوانیش داواکەیان سەیر دێتە بەرچاو، داوای چوونیان بۆ لای ئەوکەسەی دەکەن کە ئەمانەیان ناردووتە سەریان. پێیان دەڵێن دەبێ چەکەکانتان دانێن، ئەو کاتە سادق، بە دەمانچەی تەقەیان لێ دەکات و هەر سێکیان دەکوژێ. ماڵی محەمەد قادر، لە سپیلکی تووشی ماڵی سادق دێن و دەبیتە شەڕیان چەند پیاویان لێ دەکوژن. ناکۆکییەکە درێژەی دەداتێ لە ئاکامدا نزیکەی ۱۸ کەس لە هەردوو لا دەکوژرێ.

دوشمنداریییەکە، ئەمڕۆ سارد بووتەوە کەسیان لە کەسیان ناکوژێ و بەلای نەوەکانی ئێستا کارێک بووە کە نەدەبووایە ڕوو بدات، وەلێ شوێنەوارە کۆمەلایەتییە نیگەتیڤانەکەی هەر ماوە.

شوێنی ژیانی هەمیشەیی ئاغاکان، لە دوای ساڵی ۱۹۹۱دا، واتە دوای نەمانی پاڵپشتی حکومەتی عێراق و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، گۆڕانی بەسەر داهات. هەندێکیان، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان تێک نەچووبوو، لە گوندەکانیان مانەوە. هەندێکی دیکەیان لەسەرەتاوە گوندەکانیان جێ هێشت و چوون لە شارەکان جێگیر بوون، دوای ئاسایی بوونی پەیوەندییان، بۆ گوندەکانیان گەڕانەوە. وەلێ دەستیان لە خانووەکانیان نەدا، هەندێکی دیکەیان، لەبەر ئەوەی پەیوەندییان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، بەرەو باشی نەچوو، لەشارەکان مانەوە. هی واشیان هەبوو لە عێراق جێگیر بوو و هەندێکیشیان، بە نموونە، جەوهەر سوورچی موستەشاری حکومەتی عێراق بەر لە ساڵی ۲۰۰۳دا، کوردستانی جێ هێشت و لە دمشق پایتەختی سوریا، جێگیر بوو.ئاغاکان، وەکو میللەتەکە خەریکی کاروکاسبی خۆیانن. بە نموونە، فەلاحەتی و بازرگانی و کارمەندی حکومەت (ئەفسەر، پۆلیس، فەرمانبەر) و قۆنتەراتچی و کاری دیکەی لەم چەشنە. هەندێکیان، بەر لە ساڵی ۲۰۰۳دا، لە ژێر ناوی جوداجودا، مانگانەیان لە عێراق وەردەگرت.

### ٣. ردێن سپی

ردێن سپی پایەیێکی کۆمەلآیەتییە، کە لە ئەنجامی هەڵبژاردن یان ڕێکەوتن یان دەستنیشانکردن (دەوڵەت یان حزب دەستنیشانەکەی دەکات)، بە کەسێک ئەدرێت. کەوابێت پشتاوپشت نییە. روونتر، ئەوەی ئەمرۆ ردێن سپی بێت مەرج نییە سبەش هەوبێت.

ئەرکی ردێن سپی، خۆی لە چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکان، بە تایبەتی زەوی و ئاو و کێشە و کۆمەلآیەتییەکانی وەکو مەسڵەتکردن لە نێوان دوو لایەنی بە کێشە لە سەر کوشتن و ژن هەڵگرتن و شەڕکردن و هیدیکە، دەبینێتەوە.

شوێنی کۆبوونەوەی ردێن سپییان، بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، جاران کۆچک (دیوەخان) بوو. وەلێ ئێستا، لەبەر ئاڵوگۆڕ لە ژیانی کۆمەلآیەتی و سیاسی و ئابووری دێهات و دێهاتییەکان، باوی ئەو شوێنە نەماوە. کۆبوونەوەکە زۆر جار لە ژووری مێوانانی ماڵی ردێن سپی و هەندێ جاریش، لە شوێنی کاری ردێن سپییەکە دەکرێت. بە نموونە، ردێن سپی قەبیلەی مام گرد لە بەنزینخانەی بجیلی سەر ڕێگەی ئاکرێ ـ دیانا، کارە کۆمەلآیەتییەکانی خۆی، ئەنجام دەدات.

### ٣. ئەنجوومەنی دێ

دەستنیشانکردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی دێ لە گوندەکاندا، لەسەر بنەمای مەیلی سیاسی و بە پشت و بێ پشتی و پایەیی کۆمەلآیەتی و شارەزایی لە ژیانی خەڵکی گوند، ئەنجام دەدرێت. ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی دێ دەوەستێتە سەر گەورە و بچووکی گوند و چەشنی پێکهاتەی قەبیلەیی و مەیلی سیاسی و ... هتد.

ئەندامانی ئەنجوومەنی گوندی گۆسکە، کە نزیکەی شێست ماڵ دەبێت، بە نموونە، لە: ئەحمەد محەمەد ساڵح قلیچ و عومەر محەمەد ساڵح قلیچ و مەحمود مەجید قلیچ و عەبدوللا محەمەد عەبدوللا، پێکهاتووە.

ئەرکی ئەنجوومەنی دێ بریتییە لە: چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەلآیەتی و پێشکەشکردنی داوای خەڵک بە دەوڵەت و ئاگادارکردنەوەی ناوچە و مەڵبەند لە ڕووداوەکانی دێ و ... هتد.

### ٣. موختار

موختار پایەیێکی دەسەلآتی ئیدارییە. ئەمڕۆ، لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستان (جاران ئاغا یان ردێن سپی یان دەوڵەت) بە کەسێک ئەدرێت. وەلێ هەرکاتێکیش متمانەکەی لە دەست دا ئەوە چۆن پێی درابوو ئەوهاش لێی

دەستێندرێتەوە. کەوابێ وەکو ئاغا بە میرات لە باوکەوە بۆ کوڕ نامینێتەوە.

ئەرکی موختار خۆی لە سەرێکەوە لە ئاگادارکردنەوەی بەڕێوەبەری ناحیە و ڕێکخراوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە کاروبار و پێویستییەکانی خەڵکی گوند، لە سەرێکی دیکەوە ئاگادارکردنەوەی خەڵک لە ڕێنماییەکانی ئەو دوو لایەنە دەسەڵاتدارە دەبینێتەوە.

موختار کە مانگانە چل و دوو هەزار دیناری لە پارتی دیموکراتی کوردستان وەکو کۆمەک پێکردن وەردەگرێت. کێشەکان بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە کوشتن و نامووسەوە هەیە، بە ئامادە بوونی زیان پێکەوتوو و زیان پێ گەیاندوو لە مزگەوت، (مزگەوت بۆ هەموو لایێک وەکو یەکە)، چارەسەر دەکات.

### ٣. دامەزراوە ئاینی و دنیاییەکانی سوورچییان

مەبەست ئەو شوێنانەن کە خەڵکیان، بۆ نوێژی ڕۆژانە و پرسەو سەرەخۆشی و زیکر یان بۆ مەسلەت و کات بەسەر بردن، لە کاتی جوداجودا، تێدا کۆدەبێتەوە.

#### خانەقا

ئەو شوێنە ئاینییە، لە گوندی گەویلان و یەک دوو شوێنی دیکە لە نێوچەی سوورچییانی بادینان، هەیە. کاری خانەقا خۆی لە دابینکردنی شوێنی نوستن و خواردن و نوێژکردن و زکرکردن، دەبینیتەوە. میوان و مریدەکان، کە دێن بۆ سەردانی ماڵی شێخی، تاکو ئەو ڕۆژەی، بۆ شوێنەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە، لە خانەقا دەمینێنەوە و لێرەش نان و چای دەخۆن و دەخەون.

خانەقای گەویلان لە دوو بینایەی بەرامبەر بە یەک و بیست مەترێک لێک دوور، پێکهاتووە. ئەوەی دەستە راستیان بە بلۆک و چیمەنتۆ دروستکراوە و سەری چیمەنتۆ ڕێژە. پێشەکەی هەیوانە و پێبلقەی بۆ سەربان لە دەرەوە، بۆ کراوە. ئەوەی دەستە چەپیش بە خشت و قوڕ دروستکراوە و سەری بە شەقرە و کاریتە گیراوە و سەری خۆڵە بانە وەکو ئەوەی دیکە پێشەکەی هەیوانە و لێ پێبلقەی بۆ سەربان نییە. ئەو ژوورانە رایەخی دەستکردی خۆماڵی و هی مەکینەی لێ راخراوە. هەر یەکەیان ئەستوندەکی لە هەیوانەکەدا هەیە.

**زکرکردن**

کۆمەڵێک لە مرید بۆ زکرکردن لە خانەقا یان لە ماڵێکدا، لە دەوری یەک کۆدەبنەوە و، دەست بە ناوهینانی خوداو پێغەمبەر و ئیمامەکانی ئیسلامان، دەکەن ئەو ناوانە بۆ چەندین کەڕەت، دووبارە دەکرێنەوە. لەگەڵ دووبارەکردنەوەدا، دەکەونە جیهانێکی دیکە وەکو بلێیی لەو جیهانە بۆ جیهانێکی دیکە، دەچن و ئاگای لە خۆ دەبڕێ و بە عارەبی- گەر چی لە دەرەوەی زکردا بە تەواوی عارەبی نازانی- دەپاڕێتەوە. وەلێ نەوەکو هەر عارەبی نەزانەکان بەڵکو ئەوانەی عارەبیش دەزانن، لە قسەکانیان ناگەن و دوای تەواو بوونی زکرەکە، نە لە بیری ماوە چی گوتووە و نە دەشزانی چی دەگوت. ئەو جۆرە کارە وەنەبێ هەر لە زکرکردندا روو بدات بەڵکو بۆخۆم، کەسی وام دیوە کە قورئانی بە تەواوی دەخوێنێتەوە، وەلێ هەر وشەیێکی لە قورئان بۆی لەسەر کاغەزێک بنووسەوە، ناتوانی بیخوێنێتەوە. لە هەردوو حاڵەتدا، من پێم وایە، مەسەلەکە لەبەرکردنە لە ئەنجامی دووبارە کردنەوە. دەنا ئەگەر حاڵەتێکی دیکە بوایە، دەبوایە وشەکان لە دەرەوەی قورئانیش بناسرێنەوە.

مریدەکان لەچ کاتێکدا و لە هەر شوێنێک بیانەوێ زکری خۆیان دەکەن. وەلێ زکرکردن لە جەژنی رەمەزاندا و لە جەژنی قورباندا هەروەها لە وەرزی بەهار و پایزدا وەکو بلێیی فەرزە هەر بۆیەش لەو کاتانەدا مریدێکی زۆر بۆ زکرکردن لە خانەقای گەویلان، کۆدەبێتەوە.

ژن و پیاو، وەلێ هەر یەکەو لە خانەقای خۆی، وەکو یەک زکر دەکەن. ژنەکان لە ژوورێکی یەک نهۆمی، جاران دوو نهۆمی، لە تەنیشت ناندین و بەرامبەر ماڵی خۆیشک زکری خۆیان دەکەن. پیاوەکانیش لە دوو بینایەی بەرامبەر بەیەک کۆنەکەیان لە خشت و قوڕ و خۆڵەبان تازەکەیان لە بلۆک و چیمەنتۆ و سەب، دروستکراو، زکری خۆیان دەکەن. ئەمانە کەوتوونەتە خوار ماڵی خۆیشک و نزیکەی پێنج سەد مەتر لە خوار ژووری ژنانە.

ئەوەی خوارەوە، یەک لەو لوغەتانەیە کە لە زکری ژنان و پیاوان لە مردنی شێخ ئەحمەد، گوتراوە و دەگوترێ.

**بکە خاترا خودێ و پێغەمبەرا**
**لە غەریب و عەبدالێ خۆ مەنع نەکا**
**دەرگا و قاپی خانەقایێ**
**هەتا مردنێ ئەز دێ مەدحێ وراخۆ**

جـــــێـــــرم لـه ناڤ دەســـــــتـێ دۆست و بـرادەرا
والـلـه بـا عـــــالـەم بـزانـیت دۆست هەتا حــــــەشــــرا
تێـــتـــە مـــەیدانێ ئەز دێ بە گـــولا خـــۆ بێم حـــەیرانا
ئـەڤـــــــــرۆ دەنــکــێ مـــــــــرـیـد و دیـوانـا
دەگـــــــــەرێت لـە دۆر خـــــــــانـەقـــــایـێ
خــــــــــۆزی ئـەس دارەک بـامـــــــــا لـە دارا
رەبەنـا شـێن ببــــوامـــا لـە مـــــەزارێ شــــێخ بـەدیع
لە بۆ ســێــبـــەرکـــردنی لە دەورو تەسلیـــمی مـــەدیحێ
چ داوایا شــــــێخ ئەحــــــمـــــــەد نـور و پـاشـــــایا
ســـــاحب تـەکـــــیـــــە و خــــــانـەقــــایا
ســـــاحـب عـــــــەسکـەر و لـیـــــــوایا
شـــــێخ ئـەحــــمـــــەد نـورا وەیـســــــیـــــا
نــاوڤـــێ لــەتـــو لـــە کــــــــــــــەس نـیـــنـا

لوغەتێکی دیکەی قەنتاری مریدەکانی شێخی ئەوەی خوارەوەیە

بـا عــــــــالـەم بـێ خـــــــــەتـرە بـیـت
هـەتا حــــــەشــــر تـێـــــتـــــە کـــــردنـێ
لـە دایـرە و مـــــــــحـکـەمـێ پـاشـــــــایـێ مـن
نــابــرێــن حـــــــــــــەرەس و نـــۆبـــەتـداران
لە گـــــە بەیانا ســـــبــــیــــانێ بـارخـــــانـەکێ
لـە بـارخـــــــانـا شـــــــێـــــــخی مـن بـێـنـادا
کـــــــــــــــــەتـــە بـــە رۆکـــێ بـــەروارا
مـــن نــەزانــی تــە گــــــــــــــە بـەرێ بـەیــانـــێ
ئـــــەڤـــــــــــــــــە چ بـــــارابــــارا

**مزگەوت**

سوورچییەکان، وەکو موسڵمانەکانی دیکە، هەبوونی مزگەوتیان لە گوندەکانیان، بە پێویست دەزانن. هەر بۆیەش هەر دەم لە خەمی دروستکردنیدان. ئەمرۆ، مەگە چۆن بێت، دەنا گوندی بێ مزگەوتیان نییە. مزگەوت بە پارەی خەڵکی گوند بێ یان بە پارەی کەسێکی هەبوون بێ یان بە پارەی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی بێ یان بە پارەی رێکخراوێکی ئیسلامی نێودەوڵەتی، دروست دەکرێت و کەلوپەل و

رایەخی بۆ دابێن دەکرێت. مزگەوت بە تایبەتی لە گوندان سەرەڕای ئەوەی کە پێنج فەرزە نوێژی لێ دەکرێت، شوێنی پێکگەیشتنی دوو لایەنی بە کێشەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی وەکو مەسڵەت و شەڕوشۆڕ و هیدیکە. هەروەها خەڵکی ئاوایی پێش نیوەڕۆیان و عەسران بە مەبەستی بەسەربردنی کات لە بن دیوارەکەی جەم دەبن.

**گۆڕستان**

سوورچییەکان بە دارەبازە، ئەگەر ناشتن لە گۆڕستانی گوند بێ ، یان بە ترومبێل، ئەگەر ناشتن لە گۆڕستانی مەزاری سپی بێ، مردووەکانیان بۆ گۆڕستان دەبەن. ژنان لە ماڵەوە یان لەسەر گۆڕستان بە دەنگێکی پڕ لە سۆز و ئەڤین و حەسرەت و گریانەوە مەترێزەی (لاواندنەوە/ سەردوولکە)، واتە وەبیرهێنانەوەی لێهاتوویی و دەست رەنگینی و ئازایەتی مردوو، بۆ مردووەکانیان دەچرن. ژنان، وەکو خۆم لە مەزاری سپی دیتم، لە لاییک بە گریانەوە دەوەستن، کە پیاوەکان لە گۆڕەکە دوور کەوتنەوە لە دەوری گۆڕەکە، بۆ چارەگە سەعاتێک، کۆدەبنەوە. پاشان بە پێ یان بەو ترومبێلەی پێی هاتبوون، بۆ ماڵەوە دەگەڕێنەوە.

**مەزار**

مەبەست ئەو شوێنانەیە کە پیاوچاکانی (شێخەکانی تەریقەت)ی سوورچی تێدا نێژراون. ئەو شوێنانە رێز و قەدری تایبەتییان لای مریدەکان و خەڵکی دیکە هەیە. خەڵک لە جەژنان و رۆژانی هەفتە بە تایبەتی هەینییان، بە مەبەستی خێرداواکردن و لە قەزاوبەلا بە دووربوون و سەردانی مردووان، سەردانی ئەو شوێنانە دەکەن. مەزارە بە ناوبانگەکانی سوورچییان، کە خۆم سەردانیانم کردوون، ئەوانەی خوارەوەن:

**مەزاری کۆلەکا**

ئەو مەزارە کەوتووتە گوندی کۆلەکای گەورە. نزیکەی نیو دەمژمێر لە رۆژهەڵاتی گردەسێن مەرکەزی ناحیەی گردەسێن دوورە. رێگەییێکی نیوە خۆڵ و نیوە ئەسفەلتی بۆ دەچێ. لەسەر نیمچە گردێکە. ئەو مەزارە دوو مەرقەدی، بە ناوەکانی خوارەوەی لێیە:

*** گۆڕی شێخ ئەحمەدی گەورە**

ئەو گۆڕە لە سەر گردەکەیە و شوورەکی بە قەد بەژنی زەلامی بۆ کراوە وەلێ بێ گومەتە. لەو شوێنە دوو گۆڕی هەڵگیراو هەیە بەناوی شێخ ئەحمەد شێخ عەبدوڵای شێخی کۆلەکای سورچی و شێخ رەقیب لە ریز یەک و لە ژێر دار بەڕوویێکی بەتەمەن و قەد دوو ئامێزی.

*** گۆڕی باوکی شێخ ئەحمەدی گەورە**

ئەو گۆڕە لە قەد گردەکەیە و پێنج سەد مەترێک لەوەی یەکەم دوورە و گومەتێکی لەسەر کراوە و گۆڕی باوکی شێخ ئەحمەد کۆلەکی لە ژوورەوە و لە سەر دیواری نووسراوە.

مەزاری کۆلەکا، جگە لە گۆڕەکانی سەرەوە، شوێنی ناشتنی ژمارەییێکی زۆری سوورچییانە. ئەو بۆ من سەرنجڕاکێش بوو، ئەو ژمارە گۆڕانەی تەنیشت یەک و لەسەر هەریەکەیان شەهید فلان کوری فلان بوو. لەسەر کێلی مردووەکان وێنەی دەمانچە و کلاشنکۆڤ کێشراوە ئەوەش پیشەی سەربازی مردووەکان دەگەینی.

مەزاری کۆلەکا خانەقاییێکی گەورە بە بلۆک و چیمەنت و سەر کۆنکریت و هەیوان لە پێشی هەیە. لێرە پێخەف و کەرستەی خواردن (برنج، روون، شەکر، چای، خوێ، ئاگر) و ئاوی هەیە. هەر کەسێک ئارەزووی مانەوەی هەبێ دەتوانی بۆ خۆی چێشت لێ بنێ. وەلێ وەکو هی بجیل بەردەوام ئاوەدان نییە. ئەو رۆژەی من سەردانم کرد چۆل بوو و دەرگای خانەقا قفل درابوو.

**مەزاری بجیل (مەزاری سپی)**

ئەو مەزارە لە سەر گردێکە بەرامبەر بە شارەدێی بجیل مەرکەزی ناحیەی بجیل. جادەییێکی قیرتاوی لە جادەی سەرەکییەوە بۆ دەچێ. ئەو مەزارە دوو مەرقەدی سەرەکی، بە ناوەکانی خوارەوە، لێیە:

*** ئارامگای شێخ محەمەد**

ئەو ئارامگایە بریتییە لە ژوورێکی چوار گۆشە و گومبەت لەسەر. لەسەر دەرکە لە دیوی دەرەوە ناوی شێخ محەمەد نووسراوە. لە ژوورەکە تەنیا گۆڕی ئەو شێخەی تێدایە. دیواری لە چوار دەورە کراوە. لە حەوشەکە هەندێک گۆڕ هەن.

*** ئارامگای  شێخ عەبدوڵا**

ئەو ئارامگە، وەکو یەکەم، بریتییە لە ژوورێکی چوارگۆشە و گومبەت لەسەر. لەو شوێنە دوو گۆڕ هەیە. یەکەکیان بە ناوی شێخ عەبدوڵا شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد شێخ بەدیع شێخ ئەحمەدی کۆڵەکا ئەویدیکەیان بە ناوی شێخ ئەحمەدی کچکە یە.

مەزاری بجیل لەسەر بنەمای قەبیلەکان دابەش کراوە. واتە هەر یەک لە قەبیلەکان مردووەکانیان لە لاییەک دەشارنەوە و، لەگەڵ قەبیلەی دیکە تێکەڵیان ناکەن. سوورچییەکان، ئەگەر شوێنیان دوور نەبێ، مردووەکانیان لەو مەزارە دەشارنەوە. وەلێ پیاوە گەورەکانیان با لەو شوێنەشەوە دوور بن بە زۆری ئێرە دەبێت بە شوێنی هەمیشەیی هێسک و پرووسکەکانیان. سوورچییەکان پێیان وایە ئەوەی لێرە بشاردرێتەوە، بەبەر دوعای شێخەکان دەکەوی و سزای گوناحەکانی سووکتر دەبێت.

مەزاری بجیل وەکو خانەقای گەویلان بینایەکی دوو ژووری بە بلۆک و چیمەنتۆ و ساباتێکی بڵند و گەورە و بە جەمەلۆن سەر گیراو و عەرد کۆنکریت کراوی هەیە. جگە لە ناندین و پاسەوان، شتی دیکەی تایبەت بە خۆی هەیە. هەر کەسێک ئارەزووی مانەوەی هەبێ خواردن و شوێنی نووستنی بۆ دابین دەکرێت. هەمیشە ئاوەدانە.

**کۆچک (دیوەخان)**

کۆچکی گوندی گەویلان لە دوو ژووری لاکێشەیی، پڕ لە پەنجەرە و هەیوان لە پێش، پێکهاتووە. ژوورە گەورەکە، کە دەنۆڕێتە باشوور، درێژییەکەی پازدە مەتر و پانییەکەی پێنج مەترە، بە مافوور راخراوە و چەند سەرینی، بۆپشت پێدادان و هەنیشک خستنە سەر لێیە. ئەو ژۆرە، بۆ دانیشتنی ئەو مێوانانەی کە لە دەرەوە بۆ سەردان یان بۆ کاروباری خۆیان، بۆ لای داک و خۆشک دێن، داندراوە. ژوورەکەی دیکە هەر رێک لە تەنیشتی و دەرکەی بە دەرکەی ژوورە گەورەکەوەیە، وەلێ ئەوەندەی ئەو گەورە نابێ و مافووری لێ راخراوە و تاخمی دانیشتنی لێ داندراوە. لە هەیوانەکە رێزە کورسییێکی پلاستیک لە تەنیشت یەک ریزکراون. لە دەستەچەپی هەیوانەکە شوێنێک، بۆ چا لێنان، دروست کراوە.

کۆچک، شوێنی مێوانی لایدە کە بۆ سەردان و کاری تایبەتی، بۆ لای دایک و

خوشک هاتوون. هەروەها شوێنی پیاو ماقووڵانی سوورچییانە. وەلێ ئەوە مانای وانییە کە خەڵکی ئاسایی بۆی نییە لەو شوێنە دانیشێت و نان بخوات و بخەوێت.
ئێمە کە گەیشتینە گەویلان، روومان لە کۆچک کرد و لەوێندر خۆم بە وەکیلی داک خوشک ـ جەعفەر سوورچی (جەعفەر حەدێ عوسمان) ـ ناساند و لە مەبەستی سەردانەکەم، بۆ گەویلان ئاگادار کردەوە. پرسیار و وڵامەکانی نێوانمان، لە ژووری بە تاخمەکە، ئەنجام درا.

**ناندین**

ناندین شوێنی نانکردن و چێشت لێنان و هیربار شۆرین و داکردنی برنج و نیسک و نۆک و روون و شەکر و تۆ چا و ئارد و دارودور و نەفت و یەخچاڵکردنی گۆشت و ماست و پەنیر و هێلکە و خواردنی دیکەیە. خواردنەکان یا ئەوەتە مریدەکان کاتی سەردانیان بۆ ماڵی شێخی لەگەڵ خۆیان دەیان هێنن یانیش بە پارەی ماڵی شێخی دەکڕدرێن.
کاروباری ناندین، لە لایەن سی و حەفت ژن و ژمارەیەک لە پیاو، کە هەندێکیان مانگانە لە داهاتی خانەقا وەردەگریت و هەندێکیشیان بە خۆڕایی کاردەکەن، بە رێوە دەبرێت. سێ جەم خواردن لە ناندین لێ دەندرێت و نانی گەرمیش، هەر کاتێک ئارەزوو بکەیت، دەست دەکەوێت.
ناندینی خانەقا و کۆچکی گوندی گەویلان، لە دوو ژووری لە بەرد و قوڕ و خشت دروستکراوی هەیە. پێشەکەی چیمەنتۆ رێژ کراوە. لە تەنیشت کۆچک و بەرامبەر ماڵی شێخی هەڵکەوتووە.

## ٤. هەندێک داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، عەشیرەتی سوورچی

**ئینتیمای عەشیرەتی**

سوورچییایەتی لە نێوان سوورچییەکان زۆر گەرمە. سوورچێیک لە هەر شوێنێک، بە دەستی کەسێکی غەیری سوورچی، غەدر یان سەخڵەت بکرێت، سوورچییەکانی دیکە پێیان وایە ئەوە لەگەڵ ئەوانیش کراوە. هەر بۆیێش یەک دەنگ بە جواب دێن. لە خوارەوە، بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەم، چەند نموونە،

دەینمەوە. ساڵی ١٩٧٢ ناخۆشی دەکەوێتە نێوان گوندی زوڕنا و گوندێکی عارەبان، سوورچییەکانی کەنداڵ و گاوەرە بەهانایان دێن و گوندیان جێ نەهێشت، تاکو کێشەکە بە دانی ژنێک لە جیاتی ژنێک چارەسەر کرا.

سوورچییەکان هەر بۆ یەکتر وانین، بەڵکو بۆ ئەوانەش کە لەگەڵیان دەژین هەر وان. بە نموونە، کەسێک دەچێتە سەر ماڵی ئاسوورییەکی باتاسێ دانیشتووی هەولێر، لە نزیک ئەو ماڵە فەرمانگەیێکی نێودەوڵەتی هەیە، کە سوورچییەکان پاسەوانی لێ دەکەن، کە کابرای دەبینن بەو شێوە ڕەفتار دەکات، زۆر بە توندی ڕەفتاری لەگەڵ دەکەن.

**خووڕەوشت**

بە گوێرەی تێبینییەکانی خۆم کە لە ئەنجامی کاری مەیدانی کردوومن و باس و خواسی خەڵک و ئەو شتانەی لە قوتابییە سوورچییەکان گوێ بیست بوومە، بۆم دەرکەوتووە کە ڕەوشتی سوورچییەکان توندە و زووش هەڵدەچن. لە ئەنجامی ئەو ڕەوشتە تووشی خوێن ڕشتنی یەکتر هاتوون. بە نموونە، ساڵی هەزار و نۆسەد و شێست و هەشت، پیاوەکانی گوندی گوڵەک، بەربوونە گیانی یەکتر، دواتر کە بە تەنیشت گوندەکەیان تێپەڕ دەبووی، جگە لە ژن و منداڵ، پیاوت نە دەدیت. هەروەها لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی دوو هەزار و هەشت، لە هەریرێ، تەقەیان لە یەکتر کرد و لە ئەنجامدا، یەک کوژرا و دووانیش بریندار بوون.

**خوێن**

ئەو کێشەیە ئەگەر چی لە دە بیست ساڵی دوایی لە ئەنجامی دیتنی پەیوەندی نێوان کوڕ و کچێک بە چاوێکی دیکە و چارەسەرکردنی کێشەی زەوی و ئاو و پاوان لە ڕێگەی دادگا یەکجار کەم بووە. ئەو جارانەش کە دەقەومێ ئاغا یان ردێن سپی بە دەستووری عەشایری چارەسەر دەکرێت. بۆ ئەو مەبەستە ماڵی خوێنکرد بە زۆری پارە (پارەکە لە بەرکی خۆی یان هی ئاغا دەدرێت و ئەگەر نەیبوو لە قەبیلە هەرکەس بە توانای خۆی کۆدەکرێتەوە) یان ژن یان هەردووک پێکەوە بە ماڵی خوێنلێکراو دەدات. وەلێ ئەو جارانەی خوێنکردنەکە لەسەر شتێکی هیچ بێت و کوژراوەکەش یەکێکی ناودار و بە کەس و کار بێت بێ کردنەوەی خوێن کێشەکە چارەسەر ناکرێت. بە نموونە کێشەی گوندی زێلکێ تاکو ئەمڕۆ، لەبەر ئەوەی ماڵی

خوێنلێکراو کوشتنی کوڕەکەیان (کوژراوەکە باوکی شەش منداڵان بوو) بە ناهەق دەزانن مەسڵەتیان نەکردووە و ناشی کەن.

**ژن هینان و شووکردن**

شێوەکانی ژن هێنان و شووکردن لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییانەی لەو ساڵانەی دوایی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی عەشیرەتی سوورچی هاتووە شێوە ترادیسیۆنەکەی خۆی پاراستووە. چەشنەکانی ژن هینان و شووکردن ئەوانەی خوارەوەن:

**ـ بە ماڵ**

خێزانێک داوای کچی خێزانێکی دیکە بۆ کوڕەکەیان دەکات. دوای رازیبوون نۆرە دێتە سەر دیاریکردنی موقەدیمە و موئەخەرە. موقەدیمەکە بریتییە لە هەندێ پارە و یەک دوو پاچە زێڕ و موئەخەرەکەش بریتییە لە چەند میسقال زێڕ. چەندەی ئەم یان ئەویان بە پایەیی کۆمەڵایەتی و هەبوونی هەر دوو لاوە بەندە.

**ـ ژن بە ژنی**

بریتییە لە پێکدانی کچ بە کچ روونتر خێزانێک کچی خۆیان بە کوڕی خێزانێکی دیکە دەدەن. ئەوانیش لە جیاتی ئەوە کچی خۆیان بە کوڕی ئەو خێزانە دەدەن. وەلێ هەندێ کەڕەت ژن بە ژنییەکە لە نێوان باوکی کچە و برای کچە دەبێت.

**ـ گەورە بە گچکە**

خێزانێک کچی خۆیان بە کوڕێک یان پیاوێک دەدەن. ئەوانیش لە جیاتی ئەوە کچێکی گچکەی خۆیان لە کوڕی خێزانەکە مارە دەکەن. دوای گەورە بوونیان کچەی دەگوازنەوە.

ژن خواستن لە نێوان شێخەکان و ئاغاکان لە لایێکەوە و میللەت لە لایێکی دیکەوە، بە گۆتە، رێگەی لێ نەگیراوە. واتە کوڕە شێخ و کوڕە ئاغا بۆیان هەیە کچی لە میللەت بخوازن و کوڕە میللەتیش بۆی هەیە کچ لە ماڵە شێخەکان و ئاغاکان بخوازیت. وەلێ تاکو ئێستاکە، شتێکی لەو بابەتەوە، رووی نەداوە و، رووش نادات، لەبەر ئەوەی کچە شێخ یان ئاغا، بە هیچ شێوەیێک رێگە بەخۆ نادات شوو بە کوڕی چینێکی لە چینی خۆی نزمتر بکات، هەر نەبێت لەبەر گۆتەی دەوروبەرەکەی.

### کێشه لەسەر ژنان

عەشیرەتی سوورچی وەکو هەر عەشیرەتێکی دیکە رووبەڕووی هەندێ کێشه لەسەر ژنان دەبێتەوە. لە خوارەوە، دوو رووداوی خەمناک، وەکو ژن و پیاوێک بۆیان گێڕاومەتەوە، دەنووسم.

رووداوی یەکەم. کوڕ و کچێک، لە گوندی زێلکێ، پەیوەندی خۆشەویستییان دەبێت. مالّی کوڕە دوای ئاشکرا بوونی پەیوەندییەکە بۆ کوڕەکەیان داوای کچە دەکەن. وەلێ باوک و برای کچە نایدەن. کوڕە کچەکەی هەلّدەگری. مالّی کوڕە بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکە لە رێگەی پیاو ماقوولانی گوند و مالّی شێخ داوای مەسرەت دەکەن. مالّی کچە بە مەبەستی دەست گەیشتن بە کوڕ و کچە رازی دەبن. دواتر کچە بە دەستی کەس و کاری دەکوژرێت. کوڕەش خۆی دەشاریتەوە و لە کوشتن رزگار دەبێ. ئاخرەکەی مالّی کچە برا گەورەی کوڕە کە خاوەنی سێ مندالّی وردیلە بوو دەکوژن و ئەوانی دیکەش لە گوند وەدەردەنێن و ئێستاکە لە گەڕەکی باداوە لە هەولێر نیشتەجێن.

رووداوی دووەم. ژنی پیاوێکی سوورچی، وەکو کەسێکی ئاگادار لە رووداوەکە بۆی گێڕامەوە، گوایە زۆر جوان دەبێ، لەگەلّ کوڕێکی سوورچی دەست تێکەلّ دەکەن. دوای ئەوەی پیاوەکەی پێ دەزانی، کەس و کاری خۆی بۆ مالّی خۆی بانگ دەکات و لە پێش چاوی گشتیان دوو فیشەک بە ژنە وەدەنێ و ژنە دەمودەست گیان لە دەست دەدات. کەس لە کابرا ناپێچیتەوە.

### ئەدەب لە ناو سوورچییان

من لە ژێر ئەو ناونیشانە، باسی دەستنووسێک دەکەم، کە شیعری سەدرەدین شێخ بەدیع، تێدا نووسراوە. شیعرەکانم (هەلّسەنگاندنی شیعرەکان، بە پسپۆرانی ئەدەب و زمان، دەسپێرم) بە نووسراوی لە دەفتەرێکی قالبدا، لای خەسرۆ مورشید دانیشتووی گوندی زیراڤا، بینیوە. بەشێک لە شیعرەکان لای مامۆستا جەمیل دانیشتووی گوندی کێلان (کێلا)، دەست دەکەوێت. شیعرەکان، لەبەر ئەوەی زۆربەیان لە سەر بنەمالّەی شێخەکان گوتراوە، چاپ نەکراون. نموونەی شیعرەکانی ئەوانەی خوارەوەن.

یەک لە شیعرەکانی:

**ئاڤابێت گەویلان قەدیم جێی زکر و دیوانا**

**هەندەک بچووک وێ لێ نە بە ناوی تالبان**

**لە خوندنێ کەسلانن مەراق بوون لە لەعبانا**

**چل خویندنێ نەزانن وەکی جاچکێ کەرانا**

**ئەگەر ببێن ئەو کینە دێ بۆنگۆ کەم بەیانا**

**وەختێ چوونە بجیلێ دانان گۆل و مەیدانا**

**سێ جا ڤێکرا خچاندن بوونە رەڤەکە جوانا**

**وێ نزانن ت کەرن بجیل جێی ئەولیانا**

**ئەو بەوان ناقەزێن ئەگەر بچنە عاسمانا**

شیعرێکی دیکە:

**دختورا کردە تەکبیر ئەم دەچینە ریزاڤێ**

**ئەو دەرمانێ دە قۆدیا هەروێ بریقا تاڤێ**

**ئەم دێ دەستێ وان کوتین یە دگرین بۆ پراڤێ**

شیعرێکی دیکە:

**مێردێ کۆک هەر دلێرە**

**بدەرسێ خۆئی فێرە**

**لە مەکتەبا خۆ شێرە**

**خورامی بەژنا وی بیت**

**مەحمود شێخ زادێ گۆمکێ حیکمەتیش ڤیا لێرە**

**لەزگینی ماجەهانێ ئەسڵ خەلکێ کێلانێ**

**وێ هاتیە نک رزگاری یێن کورێ فاتمەخانێ**

**دا علمەکی پەیدا کەن بچیتە ئیمتحانێ**

**ئەهۆ کو روویان ڕەش بن تگە عەبدول حەمیدی گەویلانێ**

## دەرئەنجام

دەرئەنجـامی توێژینەوەکـە، هەرە گـرنگەکـانی، وەکـو من بۆی دەچم، دەبێ ئەو خاڵانەی خوارەوە بن:

١. سوورچییـەکان لـە زیاتر لە (٥٢) گوند لە گوندەکانی ناوچەی بادینان و سۆران، نیشتەجێن. کەوابێ یەک لە گەورەترین عەشیرەتە لە باشووری کوردستاندا.

٢. عـەشیـرەتی سـوورچی، لە ئەنجـامی نـاکـۆکی نێـوان خـۆیان، لـە دووری تریتـۆری عـەشیـرەتی دەبیندرێن. بە نموونە لە دەشتـی قـەراج و دەشـتی بەڕانەتی و شـوێنی دیکە.

٣. مـاڵە شـێخ (مـەبەست شـێخ ئەحـمـەدی گـەویلانی)یە دەسـەڵاتی رەهای ئـاینی و دونیایی بەسەر گشت سوورچییان هەیە.

٤. ماڵە شێخ مریدیان لە ناوچەی بادینان و سۆران و لەدەرەوەی ئەو ناوچانە زۆرە.

٥. مەزاری سپی لە بجیل و مەزاری کۆلەکا لە گوندی کۆلەکای گەورە، دوو شـوێنی هەرە پیرۆزن بۆ سوورچییان.

٦. خانەقای گەویلانی هەردەم گەرمە و خواردن و نوستنی بۆ گشت ئەوانەی شەو لێرە دەمینێنەوە، دابین دەکات.

٧. زەریفـەسـتان (کچی شێخ ئەحمەد گەویلانی) سـەرپەرشتـی ئاینی سوورچییـەکان دەکـات. سـوورچییـەکـان خـۆی و خـوشکەکـەی (گـوڵخـاتر) بە داک و خـوشک ناودەبەن.

٨. خەڵک بە ئارەزووی خۆی خواردن و حەیوان بۆ خانەقا دەبات.

٩. ئاغـایەتی وەکـو جـاران باوی نـەمـاوە. وەلێ هێشـتـا رۆڵی بەرچاو دەگـێـڕی لە چارەسـەکـردنی گـرفتـە کـۆمەڵایـەتییـەکـانی وەکـو خـوێن و کـێشـە لەسـەر ژنان و هیدیکە.

١٠. باری سـیـاسی رۆڵـی بەرچاوی هەیە لە کـزکـردن و لـە ناوبـردنی ئاغـایێک و پەیدابوونی ئـاغـاییێکی دیکە لە شوێنەکەی. واتە ئـەوەی ئەمڕۆ ئاغا بووبێ مەرج نییە بەیانی هەمان ئاغا بێ.

١١. سـوورچییـەکـان لەسـەر شـتێکی زۆر کـەم هەڵدەچن. خـۆیان و دەوروبەرەکـەیان تووشی نارەحەتی دەکەن.

١٢. کـاتی تەنگانە بە هاواری یەکـتـر دەچن. هەندێ جـاریش لەسـەر ئەو کـەسـانە دەکەنەوە، با سوورچیش نەبێ، دراوسێیان یان ناسیاویان بووینە.

١٣. سورچییەکان کێشـەیێکی ئەوتۆیان لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستـان نییـە. حکومەتیش خۆی لە کاروباری ناوخۆی عەشیرەتی بە دوور دەگرێ.

## پێشنیار

پێشنیارەکانم، کە لە ئەنجامی سەردانە مەیدانییەکانم بۆ ناوچەی سوورچییان لە بادینان و سۆران سەرچاوە دەگرێ، ئەوانەی خوارەوەن:

١. ئەم توێژینەوە بکرێ بە بنەمای توێژینەوە لەسەر ناوچە و عەشیرەتەکانی دیکەی باشووری کوردستان.
٢. پێشکێش کردنی خزمەتگوزاری (رێگەوبان، قوتابخانە، بنکەی تەندروستی) بۆ گشت گوندەکانی سوورچییان، ئەوەندەی بکرێ، بە یەک چاو.
٣. بەندکردنی ئاوی زێی گەورە لە چەند شوێنانندا بۆ ئاودانی کشتوکاڵ.
٤. قیرتاوکردنی جادەی نێوان گوندەکان.
٥. دروستکردنی پردێک لە سەر زێی بادینان لە نێوان گوندی دوبێ و گۆسکە، لە شوێن ئەو بەلەمەی کە خەڵکی لەم بەر بۆ ئەو بەر دەپەڕێنیتەوە.
٦. وشیارکردنەوەی خەڵک لە رووی رۆشنبیرییەوە.
٧. چاندنی دار لە چیایەکانی بەنی هەریر و سپیلک و زوورگەکانی سەر رێگەی بجیل و گوندی گەویلان و پاراستنی ئەوانەی هەن.

## ملخص البحث

## عشيرة سورجي

## دراسة في الاثنوجغرافية

**د. عبدالله غفور**

**جامعة صلاح الدين ـ اربيل/ كلية الاداب ـ قسم الجغرافية**

ان البحث الذي اجريته على عشيرة سورجي ضمن قضاء عقرة وشقلاوة في محافظتي دهوك واربيل هي حصيلة خمس زيارات ميدانية التي قمت بها وعلى نفقتي الخاصة خلال شهري كانون الاول من عام الفين وثمانيَة وشهر مارت من عام الفين وتسعة.

ان عشيرة سورجي، من حيث عدد قراهم ونفوسهم، احدى اكبر العشائر في جنوبي كردستان. حيث تقسم من الناحية الجغرافية الى مجموعة يمين زاب الكبير ويعرفون باسم سورجي سوران ومجموعة يسار النهر المذكور وحيث يعرفون باسم سورجي بهدينان. ان لهجة المجموعة الاولى سورانية في حين ان لهجة المجموعة الثانية هي بهدينانية.

يتألف عشيرة سورجي سوران من اربعة افخاذ باسم ماله باس ومامه سام ووسوكاسكي وكلو. في حين ان سورجي بادينان يتالف من ست افخاذ باسم ماله شيخ ومام طرد ومام ساك ومام سال ومامكه كول (توف محل) وجواربوطي. يوجد ضمن عشيرة سورجي ان صحة التعبير عوائل غير منتمين الى هذا او ذاك من الافخاذ المذكورة ويعرفون باسم شيخ زاده.

تحكم عشيرة سورجي قيادتين احداهما دينية واخرى دنيوية. القيادة الاولى تحت سلطة زريفه ستان (بنت شيخ احمد الصغير) او كما تطلق عليها دايك وخوشك (الام والاخت). ان لهذه السيدة، التي تتخذ من قرية كويلان المقر الرئيسي لسكناها، السلطة المطلقة على عشيرة سورجي سواء اكانو في بهدينان او سوران. القيادة الثانية تحت سلطة آغا. ان لكل فخذ من الافخاذ عشيرة سورجي آغا خاص به. ان هذه الاغاوات يجتمعون احيانا فيما بينهم لتدارك قضية مهمة وحساسة تتعلق بمصير عشيرة سورجي ككل.

ان شيوخ السورجيين مدفونين في مزارين رئيسيين الاولى في قرية كولكا حيت مزار شيخ احمد كولكي (الجد الاكبر لشيوخ سورجي) والثانية على تل مقابل قصبة بجيل والتي تعرف باسم مزاري سپي، حيت ضريح شيخ محمد وشيخ بديع وشيخ احمد الصغير. ان لهذه المزارات قدسية خاصة، لدى ابناء عشيرة سورجي، حيت يزورونهما باستمرار.

ان ابواب خانقا طويلان، حيت يقدم الطعام ويوفر المبيت لكل من يزورها، مفتوحة طوال اشهر السنة. يلتقي فيها مريدي شيخ احمد بهدف الزيارة واثناء وجودهم يقومون بالذكر.

# Abstract
# Surchi Tribe
# An Ethno - Geographic study



**Dr. Abdullah Ghafur**
**Department of Geography**
**College of Arts Salahadin**
**University-Erbil**



My research on the Surchi tribe within the districts Aqrah and Shaqlawah in both Arbil and Dohuk governorates is the result of five field visits and on my own budget during December of 2008 and the month-Mart in 2009.

Surchi tribe in terms of number of villages and population is one of the largest tribes in southern Kurdistan. The Surchies are divided in terms of geography into two groups, the first group in the left side of the big Al zab river which they known as the Soran Surchies, and the second group is known as Bahdini Surchi, and the dialect of the first group is Sorani and of the second group is Bahdini.

Al Surchi of Soran consists of four sub groups named Mala Blbas, Mama Sam, Sukaski, and Klo. While the Surchi of Bahdinan consists of six sub groups they are: Mala Shekh, Mam Grd, Mam Sak, Mam Sal, Mamka Kul (Tuf Mahal) and Jwarbuti. And within the surchi tribe there are some families which they donít belong to the Surchi tribe and they are known as Shekh Zada.

Two kinds of leadership are existed in the Surchi tribe, one of them is religious and the other one is mundane. The first leadership is under the control of Zrifastan (the daughter of little Shekh Ahmed) or as its known as (Daiku Khushk) (the mother and daughter). And this woman (which she is taking Kuilan village as her head quarter for her and their population) she has the full control and leadership of the Surchi tribe in both Bahdinan and Soran. The second leadership is under the control of Agha, each sub group of Surchies have their own Agha, and these Aghaís are meeting some times among them selves to discuss important and sensitive issues related to the future of Al Surchi tribe in general.

The Shaikhe's of Surrchies are buried in two main places, the first one is located in Kulka village which the grave of Shekh Ahmed Kulki is there "the big grand father of Surchi Shaikheís" and the second is located on a hill opposite to Bjil city which is known as "Mazari Spi", which the grave of Shekh Mohammed and Shekh Badeaa and little Shekh Ahmed is there. And these places have their holiness and people from Surchi tribe are visiting them continuously.

The doors of Gwelan Khanaqa are open along the year and its offering food and shelter for its visitors, and followers of Shekh Ahmed are meeting and praying there.

# هەندێ لایەنی بانگکردن
# لە زمانی کوردیدا

**پ.ی.د.ساجدە عەبدوڵڵا فەرهادی**
**بەشی کوردی/ کۆلێژی زمان**
**زانکۆی سەلاحەددین**

**د. شلێر ڕەسول محەمەد**
**بەشی کوردی/ کۆلێژی زمان**
**زانکۆی سەلاحەددین**

**پێشەکی**

**ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەو بوارەکەی:**

لێکۆڵینەوەکەمان بەناونیشانی (هەندێ لایەنی بانگکردن لە زمانی کوردیدا)یە، بانگکردن یەکێکە لەو جۆرانەی ڕستە کە بڵاوە وڕۆژانە زۆر بەکاردێت لەزماندا. هەموو لێکۆڵینەوەکە تەرخان کراوە بۆ باسکردن و لێکدانەوەی بانگکردن لە زمانی کوردیدا، کارەکە زیاتر پەیوەندی بە ئاستی سینتاکسەوە هەیەو هەندێ جاریش لەکاتی پێویستدا دەچێتە نێو ئاستەکانی تری وەک مۆرفۆلۆجی و فۆنۆلۆجی و.....

**هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە:**

لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی زانستییانەی دەربارە نەکراوە، کە هەموو لایەنەکانی ئەم جۆرە ڕستەیە بگرێتەوە هیچ کارو بەرهەمێکی بۆ تەرخان نەکراوە، جگە لەهەندێ ئاماژەی ڕێزمان نووسان نەبێ کە لابەلا لەکتێبەکاندا لەگەڵ هەندێ بابەتی تردا باسی لایەنێکی ئەم جۆرەیان کردووە. ئینجا لەبەر ئەم هۆیانەو لەبەر گرنگی بابەتەکە ئەم بابەتەمان هەڵبژاردووە. بەمەبەستی ئەوەی بەپێی توانا لێی بکۆڵینەوەو ئەو لایەنانە ڕوون بکەینەوە کەپەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە، تاکو ئەم بابەتەش وەک بابەتەکانی تری زمانی کوردی باسێکی تایبەت و سەربەخۆی هەبێت .

**کەرەستەی لێکۆڵینەوەکە:**

لەم لێکۆڵینەوەیەدا زاری کوردی ناوەڕاست بەکارهێنراوە نموونەکانیش لە بەرهەمی ئەدەبی (چیرۆک و شیعر) و قسەی ڕۆژانە وەرگیراوە.

**ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:**

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکەمان ڕێبازی زمانەوانی وەسفی شیکارییە.

**ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە:**

باسەکەمان لێکۆڵینەوەیەکی کورتە بێجگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو بەش پێک دێت:

لە بەشی یەکەمدا بەسەر ئەو کارانەدا چووینەوە، کە باس لە بانگکردن دەکەن لەگەڵ هەڵسەنگاندنێکی گشتی کارەکان.

بەشی دووەم: ئەم لایەنانەی گرتۆتەخۆ: پێناسەی بانگکردن، تایبەتییەکانی بانگکردن، شێوازەکانی بانگکردن، ئامرازەکانی بانگکردن، شێوەکانی بانگکردن، شوێنی بانگکراو لە ڕستەدا، دووبارەکردنەوە لە بانگکردندا، بەکارهێنانەکانی تری بانگکردن....

## بەشی یەکەم

پێداچوونەوە و خستنەڕووی هەندێ لەو کارانەی باس لە بانگکردن دەکەن:

ئەگەر بەسەر ئەو کارانەدا بچینەوە کە دەربارەی زمانی کوردی کراون و سەرنج لەو شوێنانە بدەین کە باس لە بانگکردن دەکەن ، دەبینین هەندێ لەم ڕێزمان نووسانە لە دوتوێی باسەکانیاندا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نا، بەڵکو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەنجەیان بۆ ئەم بابەتە ڕاکێشاوە بە پێی بیروڕای خۆیان باسیان لێوە کردووە، بەڵام نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی بەشێوەیەکی زانستییانە لە هەموو لایەنەکانی ئەم بابەتە بکۆڵنەوەو زیاتر پەرەی پێ بدەن، بۆیە بە پێویستمان زانی بەسەر ئەو کارانەدا بچینەوە و بیانخەینە ڕوو کە لەلایەن شارەزایانی زمانی کوردییەوە کراون بەو نیازەی بابەتییانە وێنەیەکی ڕوون بکێشین بۆ هەندێ لەو کارانە.

سەعید صدقی کابان لە ژێر باسی (ندا، بانگکردن)دا بەم شێوەیە باسی دەکات و دەڵێ[1]: (بانگکردنی انسان بەم ئاداتانە دەبی (ئەرێ، ئەی ) بۆ بانگکراوێ دەبن کە نزیک بی وەکو:

- ئەرێ خالد امشۆ بۆ نهاتیت.
- ئەی خدا داد لە دست طالع شوم.

(هۆ) بۆ دوورە و (هۆ هۆ) بۆ دوورترە وەکو

- هۆ عثمان بێ رەوە.
- هۆ هۆ یونس ڕاوەستە هەتا دێم.)

نووسـەر لێرەدا تەنها باس لە دوو ئامـرازی بانگکردن دەکات، بەڵام بە هیچ جـۆرێک باسی لایەنەکـانی تری بانگکردن ناکـات وەک ئامـرازەکـانی (ێ، ە، یا ،...هتد)و تایبەتییەکانی و مەبەستەکانی و...

* تۆفـیق وەهبی لە ژێرباسی (وەزیفەی ندای) باسی چۆنیەتی دروستکردنی ناوی بانگکراوی کـردووە، بەم شـێـوەی خـوارەوە[٢]:( یەکـەم/ دروسـتکردنی ناوی نیداکراو لەناوی تاکا

أ- حەرفێکی(ە) ئەخرێتە دوای ئەو ناوانەی کە دوا حەرفیان دەنگییە، ئەو ناوانەی دوا حەرفیـان حەرەکـەیە هیچ ناخرێتـە دوایانەوە وەکو (کـوڕە، جوتیارە،ئاغا، میرزا) لە پەراوێزیشدا دەڵێ بۆ جینسی مێ لەباتی (ە) زۆر جار(ێ) بە کەڵک هێنراوە وەکو (پووری، خوشکێ..)

ب- هەندێ جارئە داتی تەعریفی (ەکە) ئەخرێتە دوای ناوەوە، ئەمە بۆ نەزاکەت و دۆستی و پاڕانەوە بەکەلک ئە هێنرێ، وەکو (مارفەکە، کوڕەکە، براکە...)

ت- هەندێ جار ئەداتی (ئەی) ئەخرێتە پێش ناوەوە وەکو:
- ئەی حوکمدار، چی بێ و لە تۆ نەهێنی بێ؟

ج-ئەتوانرێ ناو بەبێ ئەدات و حەرفی زیادیش ندا بکرێ وەکو:
- شوان، ئەم رێیە بۆ کوێ ئەچێ؟

دووەم/ لە ناوی گەلا. ئەبێ لە پێشا ناوەکە بە بێ ئەداتی تەعریف گەل بکرێتەوە لە پاشـا (ا)ی ئەداتی گـەل بگۆڕدرێ بە (ی) و حـەرفـێکی (ە) لەدوای (ن)ی گەلەوە دابنرێ وەکو:

| ناوی تاک | ناوی گەل | ناوی نداکراو |
| --- | --- | --- |
| شاگیرد | شاگیردان | شاگیردینە |
| پیاو | پیاوان | پیاوینە |

لەگەڵ ئەمەشا ئەتوانرێ ئەداتێکی (ئەی)یان بخرێتە پێش، وەکو:
- ئەی شاگیردینە، دەمی تێ کۆشینە.)

نووسـەر تەنهـا باسی لایەنێکی بانـگکردنی کـردووە ئەویش دروسـتکردنی ناوی بانگکراوە بە دوو شێوە باسی کردووە، کەچی هەردووکیـان یەک شتن ئەویش دەوری

ئامرازە لە بانگکردندا، لە یەکەمیان بە حەرف ناوی دەبات (ە) و(یّ) ئەم دووانە دوو ئامرازی جیان بە پێی ڕەگەز زیاتر دیاری دەکریّ، نووسەر لەڕوانگەی دەنگسازییەوە بۆ ئەم مەسەلەیە چووە. (ینە) ئامرازە بۆ کۆ بە کاردێت، بەڵام ئەم دیسان بە حەرف ناوی دەبات. هەروەها بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بۆ دەوری ئاوازە ناکات لە دروستکردنی ناوی بانگکراودا بەتایبەتی لەنموونەی (یەکەم/ج)دا دەبوایە باسی بکردایە.

* نوری عەلی ئەمین باسی بانگکردن دەکات بە( دەنگ دان ) ناوی دەبات و دەڵیّ[٣]: (دەنگ دان بۆ گازاندە و ڕاگرتن و ورپاکردنەوەی دوێنراو (مخاطب) بەکار ئەهێنریّ) وەک:

– ئەی بووکینە بۆ لەگەڵ خەسووتان، ناسازێن!...

دەنگ دراو: ئەو ناوەیە کە ئەکەوێتە دوای ئامرازی دەنگ دانەوە وەک:

– ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاو دەردین

هەردوو گرفتار یەک ئاهی سەردین

ئامرازی دەنگ دان ئەو ئامرازانەیە کە ئەکەوێتە پێش دەنگ دراوەوە وەک (ئەی، هۆ، هۆهۆ، ئەریّ...)

– هۆ کاکەی شوان گوێم لێیە لەو بن دارە

ئەوی ئەی لێیت نای لێیتەوە دووبارە.

چەند جۆرێکیش لە دەنگدراوی دەستنیشان کردووە وەک (دیاری، وەسفی، مەبەستی،.... بۆ هەر یەکەش نموونەی هێناوەتەوە.)

هەر چەندە نووسەر هەندێ لایەنی باشی دەستنیشان کردووە وەک کەرەستەکانی بانگکردن و هەندێ لەئامرازەکان، بەڵام لایەنەکانی تری فەرامۆش کردووە و باسی نەکردووە وەک ئامرازی (ە)و (یّ) کە زۆر باون هەروەها دەوری هێزو ئاوازە لەم بابەتەدا..)

* نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی باسی دۆخی بانگکردن دەکەن و دەڵێن(٤): ( ڕەسەنی نێرو میّ لە زمانی کوردیدا لە دۆخی بانگکردنیشدا بە دیاردەکەویّ لە کرمانجی خوارووداا لەگەڵ ناوی ڕەسەنی نێر نیشانەی (ە) دێت وەک:

– کورە خوا سەلامەتت کا هەمووی دەستێک سوێندە بۆی ئەخۆیت و هیچی تر.

ناوی ڕەسەنی میّ لە زمانی کوردیدا لە دۆخی بانگکردندا نیشانەی (یّ) پێوە

دەلکێت وەک:
- کچێ تۆ بووی خۆشەویستیت لە ناو دڵی منا خنکان.
لێرەدا تەنها باس لە یەک جۆر ئامراز کراوە ئەویش بە نیشانە ناوی دەبەن لایەنەکانی تر فەرامۆش کراوە..
* کوردۆییڤ باس لە دۆخی بانگکردن دەکات دەڵێ(٥): (دۆخی بانگکردن لە دیالێکتی کرمانجی دا بۆ تاک ئەم نیشانانەی هەیە. لە سۆرانی (ێ) بۆ مێ یەو (ە) بۆ رەسەنی نێرە لە کۆدا (ینە)). نموونەشی بۆ هەر یەکێک لە مانەی هێناوەتەوە وەک:
- بابە تۆ کەی ئەچی بۆ شار؟
- خوشکێ ناوی تۆ چییە؟
- کوردینە وشیار بن رۆژی سەربەخۆیی هاتووە.
دەڵێ گەر بانگکردن بۆ چەند کەسێک بێ ئەوە نیشانەی دۆخەکە بە کۆتایی دوا ناوەوە دەلکێ، کە مەبەستیش لە بانگکردنەکە بۆ هەموو کەسەکانە، نەک تەنێ هەر ئەوەیان کە نیشانەی (ینە) ی پێوە لکاوە وەک:
- کچ و کورینە وەرنە ماڵەوە.
هەروەها هەندێ ئامرازی بانگکردنی دەستنیشان کردووە وەک: (هۆ، هۆهۆ، هۆی، یا،...)
دەڵێ ئامرازی (ئای) لە هەر دوو دیالێکتەکەدا لە دۆخی بانگکردندا بەکار دێت وەک:
- ئای ژن کراسێ من بشۆ.
لە هەردوو دیالێکتدا بۆ دارشتنی دۆخی بانگکردن ناویش لە دۆخی ڕاستەوخۆ بۆ تاک و کۆ بەکار دێت وەک:
- برا ، تۆ ئەچی بۆ کوێ؟
- خوشک و برایان، هەڵسن.
صادق بهاالدین ئامێدی دەڵێ[٦]: لە زاری سۆرانی لە بانگکردندا ئامرازی تاک بۆ ناوی نێر (ە) یە وەک:
- کوڕە تۆ ئەڵێم تۆ! بۆچی وا پەستیت.
بەڵام بۆ ناوی مێینە (ێ) یە وەک:
- خوشکێ بۆ بە خۆڕایی داوێنم دەگری.

* د. ڕەفیق شوانی دەڵێ[٧]: ( ئامرازی بانگکردن لە رووی شێوەوە دوو جۆرە:
١- سادە: هۆ، ئەرێ، هۆش، یخە،پشە،....
٢- ناسادە: هۆو، هرە، هسە، پشە (پش پش، کوت کوت ، کوچ کوچ.....)
نووسەر هەندێ لە تایبەتییەکانی ئامرازی بانگکردنیشی دەستنیشان کردووە لەوانە:
١- بە زۆری لەگەڵ رستەی فرماندار بەکار ئەهێنرێن، یاخود دەوری فرمان دەبینن لە رستەدا.
٢- ئامرازی بانگکردن، بۆ بانگکردنی گیان لەبەر بەکار دەهێنرێن چ مرۆڤ یا ئاژەڵ و پەلەوەر بێت.
٣- هەریەکەی لەم ئامرازانە دەوری بەکارهێنانی تایبەتی دەبینێ.
٤- واتادار و بێ واتان،
٥- لەرووی بونەوە ئامرازی بانگکردنی ( ە، ێ، ی، ۆ، ینە)ی لێ دەرچێ ئەوانی تر لە شێوەی وشەی واتادار دادەنرێن[٨].

فەتاح مامە عەلی دەربارەی بانگکردن دەڵێ[٩]: أ ـ دەرکەوتنی (ێ) لە کاتی بانگکردندا:




ئامرازی بانگکردنی (ئەرێ) بە شێوەیێکی بەربلاوتر لە ئامرازەکانی تری بانگکردن بەکاردێت بانگکردن لە سەردەمی پێشتر بەبێ (ئەرێ) نەوتراوە، بەلام

بەپێی ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر زماندا دێن ئەمڕۆ لە کاتی بانگکردن زۆر جار (ئەرێ) وەلائەنرێ و ناوترێت، تا ئەمــڕۆش بە وتن و بە نە وتنی (ئەرێ) کــاری بانگکردن ئەنجام دەدرێت.

**ب ـ دەرکەوتنی (ێ) لە کۆتایی هەندێ ئاوەڵناو لە کاتی بانگکردندا:**

کاڵ ـ ئەرێ کاڵێ < کاڵێ

جوان ـ ئەرێ جوانێ < جوانێ



چاوڕەش ـ ئەرێ چاوڕەشێ < چاوڕەشێ

ئەسمەر ـ ئەرێ ئەسمەرێ < ئەسمەرێ



(ئەرێ) بێجگە لەمەش کە زۆرجار پێش ناوی بانگکراو دەردەکەوێ، زۆرجاری تریش بۆ پرسیارکردن و ڕا وەرگرتن وەک:

- ئەرێ دێی؟
- ئەرێ تۆ چی دەڵێی؟

**هەڵسەنگاندنێکی گشتی کارەکانی پێشتر:**

ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو کارەکانی پێشتر تێبینی دەکرێت ئەوەیە کـە ڕێزمـان نووسـەکـان بە زۆری لە لایەنێک دەدوێن و لایەنەکـانی تر فـەرامـۆش دەکـەن. لێـرەدا چەند خـاڵێکی گـشـتی دەخـەینە روو کـە زۆربەی بەرهەمـەکـان دەگرێتەوە:

١- هەر یەک لە ڕێزمان نووسەکان زاراوە و ناوی جیاجیایان بۆ هەمان دیاردە بەکار هێناوە وەک (ندا، بانگکردن، دەنگدان، ....هتد) بەڕای ئێمە وا چاکترە تەنها (بانگکردن) بەکار بهێنرێ چونکە گشتی ترە و زۆرتریش بەکاردەهێنرێ لەوانی تر.

٢- به زۆری ڕێزمان نووسەکان تەنیا باسی (ە) و(ێ) یان کردووە لەناو هەموو ئامرازەکان هەندێکیان بە حەرف ناوی دەبەن هەندێکیشیان بە نیشانە یان ئامراز جیایان کردۆتەوە لە ئامرازەکانی تری وەک (ئەی، ئەرێ، هۆ،.......هتد) کەچی ئەمانەش ئامرازن وەکو ئەوان دەوری گرنگیان هەیە لە بانگکردندا.
٣- زۆربەی ڕێزمان نووسەکان لایەنی ڕستەسازییان فەرامۆش کردووە، لە ڕوانگەی مۆرفۆلۆجیەوە لێیان کۆڵیوەتەوە .
٤- هەندێ لە ڕێزمان نووسەکان ئامرازی بانگکردنیان بۆ دوو شێوە دەستنیشان کردووە ئەویش سادەو نسادە. بەلای ئێمەوە وا باشتر بوو بۆ مرۆڤ و گیانەوەران جیا بکرێتەوە نەک بەم شێوەیە.

## بەشی دووەم

### بانگکردن لە زمانی کوردیدا

- بانگکردن لە زماندا بە واتای دەنگ دێت[١٠].
- بانگکردن وەک زاراوەیەکی ڕێزمانی ئاگادارکردنەوەی کەسی بانگکراوە بۆ ئەوەی بێتە لات یا بەدەنگتەوە بێت[١١].
- وەک زاراوەیەکی ڕەوانبێژیش (داواکردنی کەسی بانگکەرە لە کەسی بانگکراو بۆ ئەوەی بە دەنگیەوە بێت، بەهۆی یەکێک لەو ئامرازانەی کە تایبەتن بە بانگکردن)[١٢]
- لە بەکارهێناندا درێژکردنەوەی دەنگ دەگەیەنێ بۆ بانگکردنی یەکێک لە دوورەوە.

**پێناسەی بانگکردن:**

بانگکردن ڕێڕەوێکە پەیڕەو دەکرێ بۆ بانگکردنی کەسێک، یان بۆ وریاکردنەوەی لەکارێک کە قسەکەر دەیەوێ پێی ڕابگەیەنێ بەهۆی بەکارهێنانی هەندێ ئامراز کە پێیان دەوترێ ئامرازی بانگکردن لە پێکهاتەیێکی تایبەتیدا، کە هەریەکەیان دەگونجێ لەگەڵ ئەو مەبەستەی کە قسەکەر دەیەوێ گوێگری پێ وشیار بکاتەوە بانگ دەکرێ و وشیار دەکرێتەوە.

**بانگکراو:** وەک زاراوەیەکی ڕێزمانی بەو کەسە دەوترێ کە لە لایەن بانگکەرەوە بانگ دەکرێت، واتا ئاگادار دەکرێتەوە بۆ ئەوەی بەدەم بانگەکەوە بچێت، بانگکراو

وەک گوێگر وایە ئەگەر نزیک بێ.

بانگکردن نە ڕستەیەکی تەواوە نە بەشێکە لە ڕستەش ، لەگەڵ ئەوەشدا گوتەیەکی تەواوە، لەو لایەنەش لە ڕستە دەچێت کە وەک ڕستە سەربەخۆیە و پەیوەندی نییە بە دەرەوەی خۆیەوە واتای هاتنی گوێگر دەگەیەنێ، پێویستی بە شتێکی تر نییە، کاتێ دەوترێ (هۆ لانە) ئامرازی (هۆ) تەنیا لە بانگکردندا دەتوانێ لەگەڵ ناودا گوتەیەکی تەواو پێک بهێنێ.

ڕێزمان نووسان توێژینەوەی زۆریان بۆ ئەوە کردووە کە بانگکردن ئەو کاتە گوتەیەکی تەواو پێک دەهێنی، بەڵام لە ڕستەکەدا هەست بە بوونی کارێک دەکرێت کە دەر نەکەوتبێ لەبەر هەر هۆیەک بێت بۆ نموونە:

– هۆ نەسرین (تۆم دەوێ)

هۆ نەسرین ← تۆم دەوێ (لەگەڵ تۆمە)
هۆ نەسرین ← لەگەڵ تۆمە (بانگی تۆ دەکەم)
هۆ نەسرین ← بانگی تۆ دەکەم

کە واتە کە دەوترێ (هۆ نەسرین) پێشبینی ئەوە لە ڕستەکەدا دەکرێ کە تۆ مەبەستت (تۆم دەوێ) (لەگەڵ تۆمە) (بانگی تۆ دەکەم) ە، بەڵام لەبەر زۆری بەکارهێنان و بۆ سووکی، کارەکە لابراوە و ئامرازەکە لە بریێتی ئەو بەکار هاتووە.

لەڕووی ڕستەسازیشەوە لە زۆربەی کاتدا کەسی بانگکراو لە ڕۆڵی (بەرکار)دایە واتە کە دەڵێی:

– هۆ کاوە.

واتە ١– من کاوەم دەوێ.

٢– من کاوە بانگ دەکەم.

لە هەردوو ڕستەکانی سەرەوەدا تێبینی ئەوە دەکرێ کە وەک دوو ڕستەی ڕاگەیاندنی ئاسایی ڕەفتار دەکەن، لە قالبی بانگکردن چۆتە دەرەوە، مەبەست (لە ئینشائی دەبێ بە خەبەری)

**شێوازی بانگکردن:**

بانگکردن لە کەسی بانگکەرەوە بۆ کەسی بانگکراو یەک شێوازی نییە ، بەڵکو دەگۆڕێت بە پێی پلەو پایەو تەمەن و گەورەو بچووکی... کەسی بانگکراو، چونکە بێ گومانە کە تۆ کاتێ بانگی منداڵێک یان مامۆستایەکی خۆت یان کەسێ کە بە تەمەن زۆر لێت گەورەتر بێت دەکەیت لە بانگکردنەکەدا یەک شێواز بەکار ناهێنی

کە مناڵێک بانگ دەکەی هەوڵی ئەوە نادەیت کە ڕێزو جۆرە شەرمێکی تێدا بێت وەک لە بانگکردنی مامۆستایەک یان یەکێ کە بەتەمەنترە لێت.
کەواتە جاری وا دەبێت بانگکردنەکە تایبەتییەکی دیاریکراوە وەک پیاو ماقووڵان و سەرۆکی عەشیرەت و .....هتد ئەمە زۆر بەڕوونی لە قورئانی پیرۆز دیارە کە خوای گەورە بانگی پێغەمبەری مەزن (د.خ) دەکات و بە سەرۆکی موسڵمانانی لە قەڵەم دەدات.
جاری واش دەبێت بانگەکە بە شێوەیەکی گشتی دەبێت وەک بانگکردنی خوشک و براو هاوڕێیانی هاوتەمەن...هتد. وەک:
- ئازا وەرە . (مناڵ)
- مامۆستا گیان بێ زەحمەت تا ئێرە نایەیت... (پلەو پایە)
-هۆ شیلان با بەیەکەوە بڕۆین . (خەڵکانی ئاسایی)

**تایبەتییەکانی بانگکردن:**
بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی بانگکردن دەتوانین تایبەتییەکانی لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە:
١- بەهۆی بانگکراو و ئامرازی بانگکردنەوە لە ڕستەکانی تر جیا دەکرێتەوە و شێوەی سەربەخۆی دەبێت.
٢-بانگکردن بە شێوەیەکی گشتی بۆ فەرماندان بەکاردێ، بۆیە شێوەی ڕستەی فەرماندان وەردەگرێ.
٣- بانگکراو لە ڕووی ڕستەسازییەوە بەند نییە بەڕستەوە، نەئەبێ بە بکەر نەئەبێ بە بەرکار. وەک:
-کاکە وەرە. (کاکە) نە بکەرە نەبەرکارە.
٤- لەڕووی واتاوە پەیوەندی بەڕستەوە نییە، لادانی نابێتە گۆڕینی واتاکەی.
٥- لەڕووی فۆنۆلۆجییەوە گرووپی تایبەتی بۆ خۆی وەردەگرێ و هەریەکەیان ئاوازی تایبەتی وەردەگرێ.
٦- لە بانگکردندا باس لە گوێگر دەکرێت، واتە بانگکردن بۆ گوێگرە. وەک:
- مامە وەرە.
گوێگرە.
٧- دوو جۆرە بانگکردن هەیە: بەکارهێنانی ئینشائی [هۆ کاکە]
بۆ ئیشارەتدان [من وام نە گوت برا ]

یان / من واناڵێم برا. لێرەدا بەکارهێنانی ڕەمزییە پێویست ناکات پەنجەی بۆ ڕاکێشی، مەبەستمان ئەوەیە چوارچێوەی قسەکردن دەزانێ (برا) کێیە...

٨- بانگکردن هەمیشە لە سەرەتای ڕستەوەیە، بەڵام بۆ ئیشارەتدان ناچێتە پێشەوە یان لە دواوەی ڕستەیە یان لە ناوەڕاستە .- نا برا وا نییە!

**ئامرازەکانی بانگکردن:**

هەندێ بیـــروڕا دەربارەی ئامـــرازی بانگکردن هەیە کـــە دەڵێن ئامـــرازەکـانی بانگکردن لە بنەڕەتدا ئامراز نین، بەڵکو ناوی کارن بە واتای (بانگ دەکەم) دێت، وەک ئەوە وایە کاتێ یەکێ دڵی تەنگ دەبێ وشەیەکی وەک (ئاخ) دەردەبڕێت کە بە واتای (خەم دەخۆم) دێت. لەگەڵدا بەکاربێت هەروەک چۆن لەگەڵ پۆلەکانی تری وەک (ناو، ئاوەڵناو،....هتد) بەکاردێت بەڵام ئەمە لە بانگکردندا نابێت، وەک:

* – ئەی تۆ
* – هۆ تۆ

ئەگەر بانگکردنەکە لەم شێوانەی سەرەوەدا بێت واتە ئامرازەکە لەگەڵ جێناو بەکار هاتبێ نازانرێ مەبەست کام (تۆ)یە چونکە ڕەنگە لە کەسێ زیاتر بن و تۆش تەنیا مەبەستت یەکێک بێت، بەڵام کە ناوە تایبەتییەکە وترا تەمومژی نامێنێ وەک:

- ئەی کوڕی ئازا
- هۆ هاوڕێی دوێنێ و ئەمڕۆ
- هێی کچی من
- هۆ دایکی برزۆ

کەواتە لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێک ئامراز هەن کە تایبەتن بە بانگکردنەوە بە هۆیانەوە ڕستەی بانگکردن پێک دێت هەر یەک لەم ئامرازانەش تایبەتییەتی خۆی هەیەو لەگەڵ مەبەستەکانی بانگکردن دە گونجێن لەوانە (یا، هۆ، ئەرێ، ئەی، ...هتد).

**(یا)**

ئەم ئامرازەیە لە بنچینەدا عەرەبییە هاتۆتە ناو زمانی کوردی زۆربەی کات بۆ بانگکردن بەکاردێت بە تایبەتی لەگەڵ ناوی خوداو پێغەمبەر...بۆ مەبەستی بە هاناوەهاتن (استغاثة) و بۆ دوورو نزیک بەکاردێت.وەک:

- یارەبی خودایە باوکم چاک بکەیەوە...   (ڕێگا  ل۲۷۹)
- یا محەمەد لێو بەبارو دڵ بە بوریانم مەکە
ئەی رەئیسی هەردوو دنیا، دیدە گریانم مەکە.  (قانع  ل٦)
- یا گەلاوێژ بەخێر بێیت.  (نزیک)
- یا گوڵەباغ وەرە لێرەم.  (دوور)  (لێرەدا بەرزکردنەوەی دەنگی لەگەڵدایە.)

هەندێ جار ئەم (یا)یە بۆ ڕێزلێنانی گەورە بەکاردێت ئەوکاتە لەچوارچێوەی بانگکردندا دەچێتە دەرەوە وەک: - یانەسرین پوورمە.
- یا فاتمە، بەرەو ئێرە دێت.[۱۳]

(ئەرێ)/ ئەم ئامرازە لە کاتێکدا بەکاردێت کە کەسی بانگکراو نزیکەو گوێی لە کەسی بانگکەرە، بۆیە پێویست بە درێژکردنەوەی دەنگ ناکات چونکە کەسی دووری پێبانگ ناکرێ وەک:
- ئەرێ ماندوو نەبووی.
- ئەرێ نایەی لەگەڵمان.
ئەم دووڕستەیەی سەرەوە شێوازی پرسیاریشیان پێوە دیارە.

**(ئەی)**

- ئەی خوا چی بکەم، لە داخی بەختی نا هەمواری خۆم
وا سەرم شێواوە ڕێگا نا بەمە سەرکاری خۆم.  (قانع  ل۱۳۷)

-ئەی کوردی جەفا دیدە! بەسە قەیدی ئەسارەت
تاوان بە کوتەک حاڵی نەبێ، واتا بە ئیشارەت.  (قانع ل۱۵۹)

**(هۆ)**

- هۆ خونچە، زووکە، هیوا بەرە ژوورەوە، دەرگاش لە سەرخۆتان داخەن.  (کاولاش ل٤٠)
- هۆ شوانی بەهرەدار! تێی خوڕە، چاوەڕێین
ئارایشت تەواوە، ئامادەی هەڵپەڕکێین.  (گۆران ل۵۲)
- هۆ، چ پیاو لە وێیە؟ ئەسپەکەت زین کە.  (داغستانی من ل۹٤)

زۆرجار بەتایبەتی لە لادێکاندا ئەگەر بانگکراو دووربێت و هەر لەسنووری دێیەکە بێ ئەوا بە دەنگی بەرزکردنەوەیەکی زۆرەوە (هۆ) دووبارە دەکرێتەوەو ناوی

بانگکراو بە تەواوی دەرنابڕێ، بەڵکو یا دەنگێک یا بڕگەیەک درێژکردنەوە و بەرزی و نزمی دەنگی لە گەڵدا دەبێ وەک:
- هۆ ئازا.....د هۆو......

**(هەی)**

- کە لێی ون ئەبێ بانگ ئەکا (هەی یار)
بە کوڵ ئەگریێ: هاوار هەی هاوار (دڵدار ل٢٠١)

**(ێ)**

ئەم ئامرازە لە بانگکردندا دەچێتە سەر ناوی مێ، واتە بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێت. وەک:
- کچێ...دوو سێ بڕکە دار لەم ئاگرە نێ... (حەمەدۆک ل١٦)
- ژنێ...ژنێ...کچێ لەگەڵ تۆمە...بە شەرەفم مووت بە سەرا ناهێڵم. (برایم زەبۆک ل١٩)

(ە،ۆ)/ ئەم ئامرازانەش لە بانگکردندا دەچنە سەر ناوی نێر واتە بۆ رەگەزی نێر بەکاردێن. وەک:
- کورە ... ڕاکەن... جاندار حەپسمان دەکەن. (ڕێگا ل٥٧)
- لاوۆ، لاوۆ، ئەسپە بۆرە ماندووە، جڵەوی بگرە، نیو سەعاتێک بیگێڕە. (کوێر ئۆغڵی ل٩٣)

(ینە) ئەم ئامرازە لە بانگکردندا بۆ ڕەگەزی نێر و مێ بەکاردێ لە حاڵەتی کۆدا. وەک:
- کوڕینە ...یە کێکتان بێتە ژوورەوە. (حەمەدۆک ل١٧٠)
- کچینە هۆ کچینە...کچینە گیانە...جل و بەرگە هەرە جوانەکانم، جل و بەرگە بووکێنییەکانم بۆ بێنن. (کوێر ئۆغڵی ل١٣٣)

**شێوەکانی بانگکردن:**

بانگکردن لە زمانی کوردیدا بە چەند شێوەیەک ئەنجام دەدرێت لەوانە:

**١- پرسیارکردن:** هەندێ جار بانگکردنەکە بۆ پرسیارکردنە، واتە پرسیارەکە ئاراستەی کەسی بانگکراو دەکرێ ئەویش بە هەردوو شێوەکەیەوە، پرسیارکردن بەهۆی ئامراز و بە بێ ئامراز. وەک:

- بارام، بارام گیان... چ خێرتە؟ (گەلەگورگ ل٦٤)
- هۆ جووتیار ئەحمەدی میران لە مارە؟

**٢- فەرماندان:** هەندێ جار بانگکردنەکە بۆ فەرماندانە، واتە بانگکردنەکە کاتێ ئاڕاستەی کەسی
بانگکراو دەکرێ بە شێوەی فەرماندان دەبێ. وەک:
- کاکە. کاکە...تۆزێک ڕاوەست. (حەمەدۆک ل٨٥)
- کاکێ هەستە ئەو چرایە هەڵکە... (حەمەدۆک ل١٣٩)

**٣- هەواڵدان:** هەندێ جار بانگکردنەکە بۆ هەواڵگەیاندنە، واتە هەواڵێک ئاڕاستەی کەسی بانگکراو دەکرێ. وەک:
- هۆ گوندەکەم! شاخەکەم! داغستانەکەم! ئێوە هێلانەی بیرو هەست و ئاواتی منن. (داغستانی من ل٣٤)
- بابە!!بابە، میوان!! میوانمان هات. (کاولاش ل٥٢)

**ئەو ناوانەی بانگ دەکرێن:**

لەڕستەی بانگکردندا بە شێوەیەکی گشتی ئەو ناوانەی بانگ دەکرێن ئەمانەی خوارەوەن:

**١- ناوی تایبەتی**

- وەرە حەمەدۆک...وەرە تفەنگەکەت تاقی بکەوە.(حەمەدۆک ل١٥٧)
- وریا سەد ئامان دایم وریابە
بۆ هەموو کەسێ چەشنی برابە(قانع ل٣٢٤)

**٢- ناوی گشتی:**

- هاوار! هەی دایە، هەی بابە ئامان
فریام بکەون، دەسم بە دامان(قانع ل٣٢٠)

**٣- ناوی نەناسراو:**

ئەمەش دوو شێواز دەگرێتە خۆ:

أ- بانگکردنی یەکێک کە ناوەکەی نەزانرێ لەو کاتەدا پەنا دەبرێتە بەر سیفەتێکی

کەسەکە یا پیشەکەی وەک:
- چاو جوان نایەی لە گەڵمان.
- ئەی مامۆستای بەڕێز ماندووی.

**ب- بانگکردنی یەکێکی نەناسراو لە رووی ناو و پیشە و سیفەت وەک:**
- ئەی گوێگر رزگارم کە.
- هۆ برای بەڕێز ئاگات لە ئێمەش بێ.

**٤- نازناو:**
- مەلا...مەلا... ئەگەر ئاینەکەی تۆ بەمە قایل بێت ئەوا من سەر بە مزگەوتا ناکەم. (کاولاش ل٦٢)
- کاکە، کاکە... تۆزێک ڕاوەستە. (حەمەدۆک ل٨٥)

**٥- ناوی خزمایەتی:**
-هۆ خاڵە وەرە ئیشمان پێتە.

**٦- ناوی بانگکراوی فراوانکراو:**
- سلام علیک هۆ کاکەی ئاودێر
علیک السلام پیادەی تەنیا (دڵدار ل٢١٩)
- ئەڵێ ئەی خودای مولک و ئینس و جان
بمانپارێزە لە تەفرەی شەیتان (پیرە مێرد ل٢٢٤)

**شوێنی بانگکراو لە ڕستەدا.**

لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی گشتی شوێنی بانگکراو دیاری کراوە ئەویش دەکەوێتە دوای ئامرازی بانگکردنەوە ئەگەر ڕستەکە ئامرازی لە گەڵ بوو، بەڵام ئەگەر ئامرازەکان نەوترابوون ئەوا خۆیان بە تەنیا دێن لە ڕستەکەدا وەک ئەم نموونانەی خوارەوە:
- هۆ هۆ دارا وەرەوە باوکم ئیشی پێتە.
- دارا وەرەوە....

**بانگکردن و دانەپاڵ**

خستنە پاڵ لە بانگکردندا زۆر جار لایەنی پاڕانەوەو نەرمی و نواندنی رەوشت و رەفتاری جوان دەگرێتە خۆ بەرامبەر بەکەسی بانگکراو وەک:

١- ئەی برای بەڕێز دڵخۆشم بە گەڕانەوەت.

ئەگەر کەسی بانگکەر بەم شێوەیەی کە لە ڕستەی(١)دا هاتووە بانگی کەسی بانگکراو بکات، ئەوا هەستی بانگکراو بۆلای خۆی رادەکێشێ و هەست بە دڵنەوایی و ئاسوودەیی دەکات و ڕەنگە زۆرجار وای لێ بکات کە بەدەم داواکارییەکەیدا بچێت، بە پێچەوانەی ئەو کاتە کە بەهۆی ناوی خۆیەوە بانگی دەکەیت بەتایبەتی ئەگەر بانگکردنەکە جۆرە دەنگ بەرزکردنەوەو ڕەقی تێدا بەدی بکرێت وەک:

- ئەرێ بێ دەنگ نابیت!

ڕەنگە ئەم ڕەفتارە وا لە بانگکراو بکات کە گوێی بە بانگکەر نەدات و بە دەمیەوە نەچێت.

هەندێ جار چەند ئامرازێک وەک جۆرە دەربڕینێک بۆ داواکردنی یارمەتی بەکاردێت کە دەدرێتە پاڵ هەندێ وشە وەک:

- ئەی هاوار خوایە.
- ئەی خوایە.

**دووبارەکردنەوە لە بانگکردندا:**

هەندێ جار لە قسەکردندا بانگکردن دووبارە دەبێتەوە لەبەر یەکێ لەم هۆیانە:

١- لەکاتی پاڕانەوە و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە (ئەی خوای مەزن نوێژو ڕۆژووەکانمان قبوڵ بکە).

٢- هاندان بۆ پاڕانەوە و داواکردنی یارمەتی لە خواوە(ئەی خوای گەورە بەزەییت پێماندا بێتەوەو بارمان قورس نەکەیت)

٣- بۆ زیاتر ئاگادارکردنەوەی بانگکراو، وای لێ بکەیت کە ئامۆژگارییەکانت قبوڵ بکات یا جۆرە ترساندنێک وەک لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (یا قوم انما هذه الحياة الدنيا متاع ورن الآخرة هي دار القرار)[١٤]

لێرەدا دووبارەکردنەوەی بانگکردنەکە بۆ زیاتر ئاگادارکردنەوەی بانگکراوە بۆ وازهێنان لەم بێئاگاییەی کە تیایە، مەبەست دووركەوتنەوە لە خوای گەورە.

**لابردنی ئامرازی بانگکردن:**

زۆرجار لەکاتی بانگکردندا ئامرازی بانگکردن لادەچێ بە بێ ئەوەی کار لە واتا بکات ئەمەش لەو کاتەدا دەبێت کەسی یان کەسانی بانگکراو زۆر نزیک بن ئەو

کاتە بەناوی خۆیان بانگ دەکرێن وەک:
- کاوە ئێرە باشە با دانیشین.
- جەماعەت ئێوەش نایەن.
مەرج نییە لە بانگکردندا هەموو کاتێک ئامرازەکان لابرێن، چونکە خودی ئامرازەکان زۆر جار کورتکراوەن واتە وەک برێتی وشەیەک یا دەستەواژەیەک یا ڕستەیەک بەکارهاتوون وەک:کە تۆ دەڵێی (هۆ دارا) مەبەستت ئەوەیە کە بڵێی (من تۆ بانگ دەکەم دارا) کەواتە (هۆ) لە جیاتی ڕستەی (بانگت دەکەم) بەکار هاتووە لابردنیشی کورتکردنەوەیە بۆیە مەرج نییە هەموو کورتکردنەوەیەک پەسند بێت و واتا تێک نەدات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار واتا تێک نادات، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار لای زمانەوانان بواری ئەوە دراوە کە ئامرازی بانگکردن لە هەندێ شوێندا لابرێت بەتایبەتیش لەو کاتانەدا کە کەسی بانگکراو نزیک بێت لە کەسی بانگکەر، بەمەش کردەی بانگکردنەکە جێبەجێ دەبێت گرنگ ئەوەیە کەتەمومژی واتایی دروست نەبێت و کەرەسەکانی تر بتوانن واتاو مەبەستەکە لە شێواندن بپارێزن، لێرەدا ئاوازەو جۆری دەربڕینی دەنگەکان کاریگەرییان بەسەر ئەمەوە دەبێت، لە قورئانی پیرۆزدا ئەم دیاردەیە زۆر بەر چاو دەکەوێت وەک:( دانەری زەوی و ئاسمان،......هتد)
(لابردنی ئامرازی بانگکردن تەنیا لەکاتی بانگکردنی ناوە تایبەتییەکاندا دەبێت تۆ کە بانگی یەکێک دەکەیت دەڵێی (یوسف) بەڵام نالێیت (پیاو..) مەگەر هەندێ جار پێویستی هۆنراوە ئەمە بسەپێنێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بانگکردنی ناوی تایبەتی واتە ناوی دیاریکراوی کەسان بەربڵاوترە و مەبەستیش تەنیا سووککردن و ئاسانی دەربڕینە)[١٥]
کەواتە بانگکردنی کەسێک بەو ناوەی کە هەیەتی لێڵی و نائاشکرایی لە بانگکردنەکە دروست ناکات بە تایبەتی ئەگەر ئەو کەسە نزیک بێت، واتە بە ئاسانی کردەی بانگکردنەکە جێبەجێ دەبێت بە پێچەوانەی ئەوە کە تۆ بانگی تاکێکی نەناسراو بکەیت لێڵی لە بانگکردنەکە دروست دەبێت.
- کاوە
- ئافرەت[١٦]، پیاو
لەگەڵ ناوی خوای گەورەدا هەردەم (ئەی، هۆ ) بەکاردێن، بەڵام جاری وایە خەڵکی ئامرازەکان بەکار ناهێنی تەنیا ڕوو دەکاتە خواو دەڵێ (خودایە، خوایە..) لەو کاتانەی کە مرۆڤ هانا دەباتە بەر خوای میهرەبان بۆ دەنگەوە هاتن و داوای

یارمەتی کردن ، بەڵام ئەمە بانگکردنێکی ڕاستەقینە نییە و مەرج نییە بە فیعلی جێبەجێ بێت بۆیە زیاتر دەچێتە قالبی کردەیەکی مەجازی نەک ڕاستەقینە.

### لابردنی بانگکراو

وەک چۆن لە بانگکردندا هەندێ جار ئامرازی بانگکردن لادەبرێت، دەتوانرێ هەندێ جار کەسی بانگکراو لابرێ و ئامرازەکە بۆشاییەکە پڕبکاتەوە. لە زمانی کوردیدا ئەو کاتە دەتوانرێ کەسی بانگکراو لابرێت پێش هەر شتێک کەسە بانگکراوەکە نزیک بێت و لە دوای ئامرازەکە کارێکی لە شێوەی پرسیار هەبێت وەک: - ئەرێ دەچیت؟ ناچیت؟

جاری وا دەبێت ئامرازەکەش لادەبرێت بە هۆی بەکارهێنانی هەندێ وشە و دەستەواژە یا کارەکە بەتەنیا وەک:

- زەحمەت نەبێ بیدە بە من.
- دێیت؟ (لەگەڵ ئاوازەی وتن وەک پرسیار و بانگکردن دیاری دەدات)

### سووککردن و ئاسانکردنی ناو لە کاتی بانگکردندا

لەکاتی بانگکردندا گۆڕانکاری بەسەر ناودا دێت بە تایبەتی لە هەندێ کاتدا کۆتایی ناوی بانگکراو گۆڕانی بەسەردا دێت ئەمەش زۆرجار بە لابردنی پیتێک یا زیاتر لە ناوەکەدا دەبێت و هەروەها بەرزکردنەوە و نزمکردنەوەی دەنگی لە گەڵدا دەبێت بەپێی بەکارهێنان و دەوروبەر بۆ نموونە:

نازەنین ⟵ نازە

ناسک ⟵ ناسکە

مەبەستیش لەم گۆڕانکارییە زیاتر پاراستنی وزەیە.

زۆرجار لە ناوی تاکی ناسراودا کورتکردنەوە دەبێت:

کوڕەکە ⟵ (کوڕە وەرە)

بە هەمان شێوە لە کۆتایی ئاوەڵناودا ئەم کورتکردنەوەیە دەبێت:

(کوڕە جوان وەرە)

**تێبینی:**

لە زمانی کوردیدا هەموو کورتکردنەوەیەکی وشە کە بە لابردنی پیتێک یا زیاتر دەبێت مەرج نییە تەنیا بۆ مەبەستی بانگکردن ڕوودات لە پێش هەموویانەوە وەک

باسـمـان کـرد ئاسـانـی دەربڕین و دەسـتگرتن بە وزەوە مـەبەسـتی سـەرەکـیـیـە لەم گۆڕانکارییانەدا. لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کە لە زمانی کوردیدا زۆر جار ئەم گۆڕانکارییانە بەمەبەستی تریش بەکاردێن وەک (سوککردن و بچووککردنەوەی ناو) بێجگە لەمـەش لە هەر شێـوە زارێک بە جۆرێک ئەم گـۆڕانکارییـانە روودەدەن بۆ نموونە لە شێـوازی سلێـمـانیـدا بە پلەی یەک (د)ەکـان لا دەبرێن و گـۆ ناکـرێن لە زۆربەی وشەکاندا، تەنیا ئەوەش نەبێ کە لە بانگکردندا زۆر جار هێز و ئاوازە ئەم گۆڕانکارییانە دروست دەکەن:

حەمە ⟵ لە بانگکردندا هێز لە سەر بڕگەی یەکەمە

حەمە هات ⟵ لە قسەی ئاساییدا هێز لەسەر بڕگەی دووەمە

وەک لەم نموونانەی خوارەوەدا کە بۆ (بانگکردن و بچووککردنەوە و سووککردنی وشەکە لە ئاخاوتندا بە هەمان شێوە بەکاردێت:

لە شێوە زاری سلێمانیدا:

مەحموود ⟵ خولە

مەجید ⟵ مەجی

مستەفا ⟵ مچە (لێرە زیاتر بچووککردنەوەیە)

لە شێوە زاری هەولێردا:

عوسمان ⟵ عوسە

مەحموود ⟵ حودە

### بەکارهێنانەکانی تری بانگکردن

زۆر جار بانگکردن مەبەستی تر دەگرێتە خۆ لەوانە:

**یەکەم/ کۆست کەوتن**

لە کوردیدا بە لەدەستدانی کەسێکی خۆشەویست دەوترێ، ئەم دیاردەیە لەگەڵ بانگکردندا باسی لێوە دەکرێت، چونکە جۆرێک لە بانگکردنی تێدایە، بەڵام وەک بانگکردنی ئاسایی نییە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە کەسی (کۆست کەوتوو) وەکو بانگکەر مـردووەکـەی دەلاوێنێـتـەوە و بۆ ئەمـەش پەنا دەباتە بەر بانگکردنی مـردووەکـە هەر چەندە دەزانێ کـە بانگکردنەکـە جـێـبـەجێ نابێ واتا مـردوو وەڵام ناداتەوە، بەڵام کـۆست کـەوتوو دەست دەکات بە پیاهەڵدانی مردووەکە بە خسـتنە رووی رەوشت و رەفـتاری باش و بە هەمـوو دڵـیـەوە و بەئاخ و حـەسـرەتێکی زۆرەوە دەنگ بەرز دەکاتەوە و هاوار دەکات و فرمێسک دەڕێژی بۆ ئەوەی ئامادەبووان بە

کارەساتە گەورەکەی خۆی ئاشنا بکات بۆیە ناوی دەهێنێ و دەگری کە ئەمەش زیاتر لای ئافرەتانە ئەویش بە هۆی ئەوەی کە ناتوانن ئارام بگرن، شێوازی بانگکردنی مردوو چۆنیەتی پیاهەڵدانی دوو شێواز وەردەگرێت:

١- لەم حاڵەتەدا کەسی کۆست کەوتوو مردووەکە دەلاوێنێتەوە بەناوی خۆی کە ئەمە لە شێوەی بانگکردنی تەواودا دەبێت لەم کاتانەشدا دەبێت کە کارەساتەکە زۆر گەورەیە و بەر ناگرێ، بەتایبەتی ئەم حاڵەتانە لە پرسەی گەنجدا ڕوودەدەن وەک:

- هۆ دارا گیان
- هۆ کوڕە جوانەکەم دارا
- هۆ کوڕە هێمن و ڕەوشت بەرزەکەم دارا

٢- جاری وا دەبێت کە کۆست کەوتوو دەنگی بەرزو نزم دەکاتەوە وجۆرە ئاوازی تایبەتی بە لاواندنەوەکە دەبەخشێ و دەبێتە هۆی گریانی کۆمەڵی ئامادەبووان . دەبێ ئەوەش لە یاد نەکرێ کە ناوی پیاهەڵدراو وەک خۆی واتا (بەناوی خۆی) بانگ دەکرێت چونکە ناتوانرێ جێناو لە جیاتی بەکاربێت واتا بە جێناو بانگ بکرێت وەک:

* هۆ تۆ
* هۆ ئەو

هەروەها بەناوی ڕەگەزیش پەسەند نییە بانگکردنەکە چونکە بە تەواوی ناناسرێ وەک:

- ئەی کوڕەکەم
- هۆ کچم

چونکە ئەگەر ئامادەبووان کەسی مردوو بناسن زیاتر بەشداری ناخۆشییەکە دەکەنو پرسەکە بە جۆش و خرۆشەوە بەڕێوە دەچێت.

لە ناو کورددا زۆرجار مردوو بە ناوی پیشەکەیەوە دەلاوێنرێتەوە وەک:

- دکتۆرە زیرەکەکەم
- مامۆستا دڵسۆزەکەم
- قوتابییە بچکۆڵەکەم.....

**دووەم/ داواکردنی یارمەتی**

بەڵام جاری وا دەبێت بۆ داواکردنی یارمەتی پەنا دەبرێتە بەر شێوازی (هاوارکردن)، کە ئەمیش جۆرێکە لە بانگکردن، ئەوەی کە وەڵامیش دەداتەوە بە هەمان شێوە پەنا دەباتە بەر هاوارکردن و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت و بەرزکردنەوەی دەنگی لەگەڵدایە، ئەمەش زیاتر ئەو کاتەیە کە ئەگەر کەسی بانگکراو دوور بێت وەک:

- هۆ خەڵکینە مەترسییە....

زۆرجار بۆ داواکردنی یارمەتی پەنا دەبرێتە بەر بانگکردن، بانگکردنەکە ئاسایی دەبێت ئەگەر ئەو کەسەی داوای یارمەتی لێ دەکەیت نزیک بێت وەک:

- ئەرێ ئەو کتێبەم نادەیتێ.
- بێ زەحمەت تۆزێ خۆت لادە.

ڕەنگە جاری وا هەبێت ئەگەر کەسی بانگکەر واتا (داواکەری یارمەتی) مەترسییەکی زۆری لەسەر بێ و هاوارەکە وەک رستە نەبێ، ئەگەر لەناو ئاودا بێ مەلە نەزانێ رەنگە جۆرە دەنگێک دەربڕێت لە شێوەی هاوارکردن.

بە هەمان شێوە لە کاتی دوعاکردندا خەڵکی بانگی خوای گەورە دەکات واتە داوای یارمەتی دەکات کە داواکارییەکەی قبوڵ بکات وەک:

- خوایە بە بەهەشتی خۆتمان شاد بکە.
- خوایە لە گوناهەکانمان خۆش بیت.

**ئەنجام**

١- شێوازی بانگکردن رێگاییێکە بۆ بانگکردنی یا ئاگادارکردنەوەی کەسێ کە قسەکەر واتا بانگکەر دەیەوێت هەواڵێکی پێ ڕابگەیەنێ بە هۆی بەکارهێنانی هەندێ ئامراز کە بە پێی مەبەستی بانگکەر لە بانگکردنەکەدا بەکاردێت بۆ سەرنجڕاکێشانی بانگکراو.

٢- ڕستەی بانگکردن بەهۆی بانگکراو و ئامرازی بانگکردنەوە لە ڕستەکانی تر جیا دەکرێتەوە و شێوەی سەربەخۆی دەبێت.

٣- دوو جۆرە بانگکردن هەیە أ-بەکارهێنانی ئینشائی وەک [هۆ کاکە]

ب- بۆ ئیشارەتدان وەک [من وام نە گوت برا]

٤- بانگکردن لە زمانی کوردیدا بە چەند شێوەیەک ئەنجام دەدرێت لەوانە: پرسیارکردن ،فەرمانداان، هەواڵگەیاندن...

٥- له زمانی کوردیدا به شێوەیەکی گشتی شوێنی بانگکراو دیاریکراوە ئەویش دەکەوێتە دوای ئامرازی بانگکردنەوە ئەگەر ڕستەکە ئامرازی لەگەڵ بوو، بەڵام ئەگەر ئامرازەکان نەوترابوون ئەوا خۆیان بە تەنیا دێن لە ڕستەکەدا.
٦- بێجگە لە ئاگاداركردنەوە و بەدەنگەوەهاتن جاری وا دەبێت بانگكردن بەمەبەستی تر بەکاردێت وەک پیاهەڵدان بە مردوو لاواندنەوەی لە شێوەی بانگکردندا، بەڵام بانگکەر چاوەڕێی وەڵام ناکات.
٧- مەرج نییە کورتکردنەوە یا سووککردنی هەندێ ناو هەموو کاتێک بەمەبەستی بانگکردن بێت جاری وا دەبێت بۆ مەبەستی تر بەکاردێت وەک بچووککردنەوە و ئاسانی دەربڕین.
٨- کردەی بانگکردن زۆرجار دەکەوێتە ژێر کاریگەری هێزو ئاوازەی تایبەتی، چونکە بەرزکردنەوە و درێژ کردنەوەی تێدایە.

## سەرچاوەکان


### سەرچاوەکان بە کوردی

١- تۆفیق وەهبی / دەستوری زمانی کوردی/ بەغدا/ ١٩٢٩
٢- ڕەفیق محمد محی الدین شوانی/چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی /هەولێر/ ٢٠٠١
٣- سعید صدقی کابان/ مختصر صرف و نحوی کوردی/بەغدا/١٩٢٨
٤- صادق بهاالدین ئامێدی/ ڕێزمانی کوردی /بەغدا/١٩٨٧
٥- فەتاح مامە عەلی/گۆڕانی /ا/ بۆ /ێ/ و چەند تایبەتمەندییەکی /ێ/ لە زمانی کوردیدا. باسێکی بڵاو نەکراوە.
٦- نوری عەلی ئەمین/ قەواعیدی زمانی کوردی لە (صرف و نەحو)دا/بەغدا/١٩٥٦
٧- نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی/ڕێزمانی کوردی/هەولێر/١٩٨٢

### سەرچاوەکان بە عەرەبی

١- اساليب الطلب عند النحويين والبلاغيين /١٩٨٢
٢- الاصول في النحو، ج١، لأبي بكر السراج/ النجف/ ١٩٧٣
٣- عروس الافراح- شروح التلخيص، ج٣، بهاءالدين السبكي
٤- كتاب المقتصد في شرح الايضاح/ لعبدالقاهر الجرجاني/ العراق/ ١٩٨٢

**پەراوێزەکان**

(١) سەعید صدقی کابان، ١٩٢٩، ل٥٩.

(٢) تۆفیق وەهبی، ١٩٢٩، ل٤٨.

(٣) نوری عەلی امین ١٩٥٦ ل٧٤

(٤) د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ١٩٨٢ ، ل٤٥.

(٥) کوردۆییڤ،١٩٨٦،ل

(٦) صادق بها ءالدین ئامێدی، ١٩٨٧، ل٤٤٠

(٧) د. رەفیق شوانی، ٢٠٠١، ل ١٨٣.

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٥ -٨٦.

(٩) فتاح مامە علی، ل٨.

(١٠) اسالیب الطلب عند النحویین والبلاغیین، ١٩٨٢، ص٢١٧.

(١١) الاصول في النحو، ١٩٧٣ ص١ ٤٠.

(١٢) عروس الافراح، ج٣، ص ێ.

(١٣) ئەم بەکارهێنانە زیاتر لە شێوەزاری (کۆیە) بەکاردێت.

(١٤) سورة غافر الآیة ٣٨......٤١

(١٥) کتاب المقتصد في شرح الایضاح، ج٢، ص٧٦٠.

(١٦) مەبەست لێرە ئەوە نییە کە پیاوێک وەک لە ناو کورددا باوە بانگی خێزانەکەی خۆی بە (ئافرەت) دەکات لێرەدا کەس و دەوروبەر دیارە کە مەبەست تایبەتی کردنی خێزانی خۆیەتی.

## ملخص البحث

## بعض جوانب اسلوب النداء في اللغة الكوردية

أ.م.د. ساجدة عبدالله فرهادي
قسم اللغة الكردية / كلية اللغات
جامعة صلاح الدين

د. شلير رسول محمد
قسم اللغة الكردية / كلية اللغات
جامعة صلاح الدين

(بعض جوانب اسلوب النداء في اللغة الكردية) النداء نوع من الأساليب المستعملة في اللغة، ويتضمن البحث تحليل لأسلوب النداء من الناحية النحوية ويتداخل احياناً مع المستويين الصرفي والصوتي، أستعملت في البحث اللهجة الوسطية، والأمثلة من النتاجات الأدبية (القصص والشعر) مع الأعتماد على اللهجة العامية أي ( لغة التكلمْ) في بعض الأحيان، والمنهج المتَبعْ في البحث هو المنهج الوصفي. يتألف البحث عدا المقدمة والنتائج من فصلين، يتضمن الفصل الأول مراجعة عامة وتقييم للدراسات السابقة بشأن (أسلوب النداء) في اللغة الكردية، أما الفصل الثاني فيشمل، تعريف النداء، موقع المنادى من الجملة، التكرار في النداء مع استعمالات اخرى للنداء تليه النتائج مع ملخص البحث باللغة العربية واللغة الأنكليزية مع قائمة بالمصادر المستعملة في البحث.

## Abstract


### Some aspects of vocative style in Kurdish language



Assist. Prof. Dr. Sajida Abdullah Farhadi
Kurdish department- College of languages
Salahaddin University

Dr. Shler Rasul Muhammad
Kurdish department- College of languages
Salahaddin University



**The paper is entitled "Some Aspects of Vocative Style in Kurdish Language". Vocative is a style used in Language. The study analyzes vocative style syntactically, somdtimes, interrelates with morphology and phonology.**

**The data are taken from central kurmanji , specifically Litererry works (poetry and stories) , and often the slang (spoken language) is used too. The method followed in this study is descriptive.**

**In addition to the introduction, the study consists of two sections. The**

**fiirst section is a review of the previous works in the field of vocative style in kurdish .The second section discusses the definition ,the position of the vociferant in sentence ,repetition in vocative style , and the other uses of vocative .**

**At the end the conclusions a summary in Arabic and English and the list of references are presented .**

# الاضطرابات النفسية لدى النساء بعد تعرضهن للقصف الكيمياوي في مدينة حلبجة الشهيدة

اعداد
البروفسور د. شه وبو عبدالله ملا طاهر
كلية التربية للعلوم الانسانية / جامعة صلاح الدين

**مشكلة البحث وأهميته :**

اثبتت نتائج البحوث والدراسات ان تأثيرات الخبرات المؤلمة للحروب على النساء والاطفال وعما يعانون من قساوة وبشاعة الحروب، فالانتقال من مكان الحرب او التجهيز او الاسر ومشاهدة اعمال العنف والقتل وحمل الاسلحة في وجوههم او وجود ضحايا وغيرها من مترتبات الحروب تمثل بعضا من الخبرات الصدمية التي تواجه الاطفال والنساء في تلك البلاد التي تتعرض لحروب او عدوان وليس هناك شك بان مثل هذه الخبرات المؤلمة لها تاثير كبير على افكارهم واتجاهاتهم نحو المجتمع وعلاقتهم بالآخرين ونظرتهم الى الحياة والمستقبل، ومن الخطأ ان نفترض ان آثار الحرب والصدمات سوف تزول او تذوب مع الزمن (terr1983).

ومن طبيعة هذه الآثار والاحداث تؤثر في الافراد والاسرة والمجتمع بطرق مختلفة كثيرة، مباشرة ـــ وغير مباشرة، ويصل هذا التاثير الى حد انتقال اثر هذه الاضطرابات الى اعضاء الاسرة وتاثيرهم في بعضهم بعضا وفي حياتهم الاسرية والعلاقات المتبادلة بين اعضاء الاسرة وانتقالها عبر الاجيال.

لقد قصفت مدينة حلبجة بالسلاح الكيمياوي في ١٩٨٨/٣/١٦ وكانت اكثرية النساء العينة في تلك الفترة هن في مرحلة الطفولة عندما تعرضن للقصف الكيمياوي تاثرت عليهن فضلا عن، مشاهدة المواقف المرعبة كقتل الاب والام او احد افراد الاسرة ومشاهدتهن جثث الشهداء في كل انحاء المدينة والرؤيا الفعلية لمشاهد الموت الجماعي او الاصابة...، وذهابهن مع الناجين من اسرهن مشيا على الاقدام الى الحدود الايرانية بالرغم من تاثرهن وجرحهن

بالغازات السامة وشعورهن بالآلام والجوع والعطش والبرودة وبعد وصول هذه الاسرى الى ايران تم زجهم في معسكرات بدائية وبعد مكوثهن اكثر من اربعة اشهر صدر عفو عام وبدأت هذه العوائل بالعودة الى الوطن متوقعين بان الحكومة تستقبلهم بالزهور والحلويات وتعوضهن بما لحق بهم من الاضرار والمعاناة، وعند وصولهم الى الاراضي العراقية تفاجئوا عندما شاهدوا سيارات عسكرية بانتظارهم لنقلهم الى طواريء السليمانية، وبعد يومين في الطورايء تم عزل الرجال عن النساء والاطفال والشيوخ فقد حشروا داخل سيارات (٥٠) او (٦٠) سجينا داخل سيارات عسكرية بدون نوافذ صمم لحمل نصف هذا العدد، وسيقوا الى سجن (نقرة سلمان ) في الصحراء الغربية قرب حدود السعودية، استغرقت هذه الرحلة من السليمانية مرورا بكركوك ثم بغداد او المحافظات الجنوبية والسماوة ثم هذا السجن اللعين، اكثر من (١٥) ساعة بدون توقف ولم يزودوا المسجونين بأي طعام او ماء وحرارة شهر آب في المنطقة الصحراوية وعلى الرغم من بكاء الاطفال وصياح النساء ولكن وجود الجنود مع اسلحتهم كان كفيلا باسكات اي تذمر.

وعلى الرغم من قتل اكثر من (٦٠٠٠) ست آلاف شخص بتلك الغازات السامة في الحال وماتوا اعداد كثيرة فيما بعد وعانى الكثير من الجروح والتشوهات والعاهات الجسمية الدائمية الى هذا اليوم، ومن يدري معاناة الاجيال القادمة في آثار تلك الغازات المدمرة التي احدثت تغيرات مرضية في جينات آبائهم وامهاتهم.

تبدو اهمية هذه الدراسة في انها تتناول نساء مدينة حلبجة الشهيدة وهن نصف المجتمع فان تاثيرهذه الغازات على صحتهن النفسية ودرجة توافقهن ومعاناتهن من اضطرابات ومشكلات قد تستمر معهن لزمن غير معلوم، ولكونهن امهات فان هذه الاضطرابات قد تؤثر في تربية اطفالهن مستقبلا، لذا من الضروري وضع خطط وبرامج للتدخل الارشادي لمساعدتهن على التوصل الى حلول توافقية لما تعانين من المشكلات والاضطرابات فضلا بان هذه الدراسة تعد اول دراسة تطبيقية ميدانية اجريت على تلك النسوة.

**اهداف البحث :**

**يهدف البحث الى:**

١. التعرف على اهم الاضطرابات التي تعاني منها النساء بعد تعرضهن للقصف الكيمياوي في مدينة حلبجة الشهيدة.

٢. التعرف على اهم مجالات التي تتبدئ فيها الاضطرابات لدى النساء بعد تعرضهن للقصف الكيمياوي.

**حدود البحث**

يقتصر البحث على عينة من النساء اللاتي تعرضن للقصف الكيمياوي في مدينة حلبجة الشهيدة فقط عام ٢٠٠٧ ذكرى مأساة حلبجة.

**تعريف الاضطرابات النفسية:**

"انها عبارة عن مجموعة من الانحرافات التي لاتنجم عن علة عضوية أو تلف في تراكيب المخ، بل هو انحراف وظيفي في الشخصية يرجع اساساً الى الخبرات المؤلمة او الصدمات الانفعالية او سوء علاقات الفرد مع الوسط الاجتماعي الذي يعيش فيه ويتفاعل ومع الوان في الخبرات المؤلمة التي تعرض لها الفرد في ماض حياته[٣].

**مأساة حلبجة:**

بدأ الهجوم بالطائرات من قبل النظام الظالم في منتصف صباح اليوم /١٦ آذار/١٩٨٨ بغارات جوية وقصف مدفعي، كان معظم اسر حلبجة قد بنوا ملاجيء بدائية ضد الغارات في بيوتهم، وقد احتشد البعض داخل الملاجيء، وان الهجمات الاولى قد اشتملت على استخدام قنابل (النابالم) والفسفور كان لها دوي هائل مقرون بلهيب ضخم ولها قدرة تدميرية كبيرة، استمرت الغارات الجوية لبضع ساعات لم تكن غارة واحدة فحسب، كي يتمكن الناس من استعادة انفاسهم قبل ان تبدأ غارة اخرى، كانت الطائرات تدور في السماء بشكل مستمر تنتهي ست منها وتأتي ست اخرى وتفرغ حمولتها بمعدل قنبلتين لكل طائرة وتعرضت المدينة الى (٣٣) غارة في ذلك اليوم والقيت (٣٩٦) قنبلة على هذه

المدينة الصغيرة، وقد اكد ذلك شهود عيان[1]، كانت هذه القنابل تهتز الارض وتثير الهلع والرعب في نفوسنا وتصم الاذان بشدتها وقوتها، وكنا نتوقع في كل لحظة ان تقع احدى القنابل فوق رؤوسنا، وكنا نصاب بصمم وقتي بعد كل انفجار ونحس بان يفجر رؤوسنا او تنفجر شرايين قلوبنا من ازدياد نبضاتها واندفاع الدم منها، اصوات الانفجارات لم تكن تحتمل، وفي الساعة الثالثة من بعد الظهر، شم الناس رائحة غير طبيعية تشبه رائحة التفاح او رائحة العطور او رائحة كريهه كرائحة الثوم .

واكدت شاهدة عيان اخرى[2] عندما خرجنا الى الشارع اصابنا ذهول مما رأينا لقد تصورت انني في مدينة اخرى اراها لاول مرة انها ليست مدينة حلبجة الجميلة التي ترعرع فيها اكثرية شعراء الكورد لقد تهدمت معظم الدور ولم يبق شباك او باب لم ينكسر، اشجارها وبساتينها اصبحت اكوام من الفحم.

كان لقصف الطائرات مهمات شتى لانجاح القصف الكيمياوي الذي اعقبه:

اولا : لكي تفتح الابواب والنوافذ حتى تدخل الغازات السامة في داخل كل الدور بسهولة.

ثانيا : لكي يجمع الناس في بيوتهم حيث يسهل الغاز الى ان يصل الى اكبر عدد من الاماكن، ونظرا للجوء الناس الى السراديب والملاجيء لتفادي شظايا القنابل، ولكون الغازات اثقل من الهواء فكانت تتسرب الى الاماكن الواطئة لتقتل عددا اكثر من الناس.

وبعد انتهاء القصف بات الظلام يزحف ولم تكن هنالك انوار في الشوارع، وشاهد الناجين تحت الضوء الباهت مشاهد مرعبة كابوسية، فقد كانت جثث الموتى ـــ من البشر والحيوانات ـــ مبعثرة في الشوارع متراكمة عند مدخل البيوت وساقطة في الشوارع، ويمشي الناجون باضطراب كأنهم سكارى وقد اثرت الغازات على اعينهم وكانو بالكاد يبصرون، كانو يشعرون بحرقة في الاجفان والانف والحلق، لقد اختلطت روائح الغبار والحرائق والبارود والغازات السامة، لقد

---

(١) هنا تشير الباحثة ان من شهود العيان والدتها واثنان من اخواتها واخوها فائق فضلا عن اكثرية اقرباءها ومعارفها.

(٢) من مذكرات شاهدة عيان اخرى تدعى (هرمي فرج عبدالله) والتي ترجمتها الى اللغة العربية الاستاذ طه بابان في كتابه عالم الكرد المرعب الكتاب الاول...

هرب الناجون نحو الحدود الايرانية، وادت كثرة الامطار الشديدة والبرودة والمواد السامة الى سوء احوالهم، مات الكثير من الاطفال والشيوخ في الطريق الطويل، ويتطلب الوصول الى المناطق الحدودية اكثر من (٢٤) ساعة فلنا نتصور فقط حجم الآلام ومعاناة هؤلاء في صراعهم مع الموت. طريق طويل ومع الافتقار الى الادوية والاجهزة الطبية التي تعينهم لازالة السموم من خلايا اجسادهم، وقلة المعالجة الطبية، في اليوم التالي عادت الطائرات تلاحق الناجين وتصب الغازات السامة على سيول المهاجرين وترى مئات الجثث ممدة على طول الطريق ومئات الاطفال والنساء الذين فقدوا اسرهم، فقد آلت الحكومة الى نفسها بان تبيد سكان حلبجة برمتها ولا ينجو منها احد حيا...

ويقول شهود عيان ان مجاميع من جثث راقدة على طول الطريق لم يظهر في وجوههم اي التواء او تشيخ لم يتعذبوا كثيرا كانهم تحولوا الى هياكل شمعية فقد كانت وجوههم تلمع ويبدون وكأنهم نائمين في نوم عميق وليسوا موتى.

وبعد دخول الناجين الى الحدود الايرانية تم توزيعهم الى (١٢) معسكرا وكل معسكر فيه ثلاثة الاف خيمة وكانت ايران تستقبل اللاجئين وتعد لهم جميع احتياجاتهم المطلوبة فضلا عن ذلك امتلأت مستشفيات ايران بالوف الجرحى والمصابين من القصف المذكور، وعرض على شاشات التلفزيون وزار المنطقة الصحفيين والمهتمين ومن بينهم ممثل عن السكرتير العام للامم المتحدة وتأكد لديه بان الحكومة العراقية استخدمت السلاح الكيمياوي ضد الكورد بنطاق لم يسبق له مثيل ( نفس المصدر ).

## انواع الغازات السامة التي استخدمت في مدينة حلبجة الشهيدة:

بعد مأساة حلبجة شكلت الامم المتحدة اول بعثة لها برئاسة البرفسور (**Abin Hyndricks**) الى كوردستان العراق للتحقيق في احداث حلبجة واطرافها بتاريخ ١٩٨٨/٤/١١.

يقول ب. د. آوبين عند وصولنا الى حلبجة رأينا مجموعة من المواشي تحت انقاض المنازل المهدمة وقد تعفنت كما لاحظنا جثة انسان تحت الانقاض ذاتها،

كانت يداه ظاهرتين وقد ازرقت الاظافر، كنا نجمع عينات من مجمل الاشياء من جثة طفل او امراة، ومن بقايا القنابل، شظايا وقطع متناثرة هنا وهناك وكذلك عينات من النباتات وحتى الاحجار المحروقة وكل العينات التي تم التقاطها غطيناها باحكام وصنفناها بدقة كي نجري عليها اختباراتنا الخاصة في جامعة غينيتي في بلجيكا.

يؤكد "اوبين": مجمل الاختبارات التي جريناها على سكان حلبجة واطرافها ثبتت بشكل قطعي استخدام الاسلحة الكيمياوية وكل الوفيات والاصابات كانت نتيجة الغازات الاتية:

١. غاز زنف **yperite** خليط فوسفاتي يشل البلازما .
٢. غاز تابون **tabun gas** .
٣. غاز الاعصاب **neurotoxin gas** : يسبب في خروج العين من حدقة ونزف الدماء من افواههم وانوفهم.
٤. غاز الخردل **mustard** .
٥. غاز **Sarin gas**.
٦. غاز الحروق والفقاعات الجلدية مثل موستارد وليوزايد.
٧. غاز افلاتوكسين يصيب الانسان بسرطان الكبد.
٨. غازات اخرى مثل السيانيد والغاز الخانق......٢١ ص٢٥

هذا وقد اشتركت (١٩٨) شركة عالمية كبرى في مساعدة الحكومة العراقية في تجهيز وتحضير الغازات السامة (السلاح الكيمياوي) توصلت المنظمات الدولية العاملة في حقوق الانسان الى اسماء هذه الشركات، وهذه الشركات تنتمي الى مختلف البلدان (ارجنتين - نمسا - المانيا - بلجيكا - برازيل - فرنسا - هند - ايطاليا - اسبانيا - بريطانيا - الولايات المتحدة الامريكية)،كانت تزود هذه الشركات العراق بتكنولوجيا تطوير الاسلحة الجرثومية والكيمياوية والنووية والصواريخ، وكانت هذه الشركات على علم ضد من كانت تستخدم هذه السموم (٤ ص ٤٨٣) لذا من الضروري على المجتمع الدولي فرض العقوبات على هذه الشركات وتعويض الكورد بما يناسب ما لحقهم من الآثار النفسية والاجتماعية ومعيشة صعبة ومعاناة المسجونين والقتل والدمار.

